# ١٠٠ بابەت سەبارەت بە ڕۆژووی ڕەمەزان



ئامادەکردنی
ستافی ماڵپەڕی وەڵامەکان و کەناڵی بەکورتی
www.walamakan.com

# کەناڵی بەکورتی

بۆ بڵاوکردنەوەی حوکمە شەرعییەکان بە کورتی

## پێشبڕکێی خولی دووەم

## تایبەت بە حوکم و ئادابەکانی ڕۆژووی ڕەمەزان

@BA_KURTY

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى
ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٨٣ ﴾ البقرة

بسم الله الرحمن الرحيم

خوشک و برایانی بەڕێز : دوای ئەنجامدانی خولی یەکەمی پێشبڕکێی کەناڵی بە (کورتی) لەتلیگرام کە زیاتر لە (١٤٠٠) کەس لە خوشک و برایانمان بەشداریان کرد ، بەباش و گرنگمان زانیی خولی دووم دەست پێ بکەین و بە بۆنەی نزیک بونەوەی مانگی پیرۆزی ڕەمەزان تایبەتی بکەین بە حوکم و ئادابەکانی ڕۆژووی ڕەمەزان و (٣٠) پرسیار لەم کتێبە دەربێنین و بە شێوەی هەڵبژاردن و بە ڕێگەی ئۆنلاین ئاڕاستەی ئێوەی بەڕێزی بکەین ، بۆ ئەوەی پێش هاتنی مانگی ڕەمەزان شارەزابن لەو حوکمە گرنگانەی کە پێویستە هەموو موسڵمانێک بیزانێت.

بۆیە داواکارین لە هەمووتان ئەم کتێبەیە بە وردی بخوێننەوە چونکە پرسیارەکان تەنها لەم کتێبە دێتەوە ، و زۆرترین زانیاری تێدایە سەبارەت بە ئەحکامەکانی ڕۆژوو ، وە هەروەها داواکارین هاوڕێکانتان لەم پێشبڕکێ یە ئاگادار بکەنەوە بۆ ئەوەی ئەوانیش سودمەند بن لە شارەزابوون لە حوکمەکانی ڕۆژوو .

## چەند تێبینیەکی گرنگ :

**یەکەم :** تاقی کردنەوەکە لەسەر (١٠٠) نمرەیە بەم شێوەیە :

أ. (٦٠) نمرە بۆ پرسیارەکان واتە هەر پرسیارێ (٢) نمرە .

ب. (٣٠) نمرەش بۆ ئەو بەڕێزەیە کەم کتێبە هەمووی دەخوێنێتەوە ، چونکە هەموو پرسیارەکان لە ناو ئەم کتێبەدا دەرمانهێناوە واتە تەنها ئەم کتێبە داخلە بۆ تاقیکردنەوەکە.

ج. (١٠) نمرەش بۆ ئەو بەڕێزەیە کە لینکی کەناڵی (بەکورتی) دەنێرێت بۆ پێنج لە هاوڕێکانی یان لە یەکێک لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکانی وەکو (فەیسبوک ، ماسنجەر ، تلیگرام ، انستگرام ) بڵاو دەکاتەوە ، یان لە هەر گروپ چاتێک دایدەنێت .

واتە : گەر ئەم کتێبەی بەردەستت بخوێنیتەوە و لینکی (کەناڵی بەکورتی)یش بڵاوبکەیتەوە ئەوا (٤٠) نمرەت مسۆگەرە ، چونکە پرسیاری یەکەم و دوەمی فۆرمەکە لەسەر ئەم دوانەیە .

**دووەم :** کاتی دەست پێکردنی تاقیکردنەوەکە (٢٥)ی شەعبان دەبێت واتە پێنج ڕۆژ پێش مانگی پیرۆزی ڕەمەزان و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بەردەوام دەبێت و فۆرمی تاقیکردنەوەکە داناخرێت.

سێیەم: لەئێستادا پێویست بەناونوسین ناکات بەڵکو ڕۆژی تاقیکردنەوە لەفۆرمی پرسیارەکان ناوی خۆت دەنوسی.

چوارەم : لەکاتی تاقیکردنەوەکە نابێ سەیری ئەم کتێبە بکەی ، بۆیە لە ئێستاوە تاوەکو ڕۆژی تاقیکردنەوە هەوڵبدە چەندجارێک ئەم کتێبەیە بە وردی بخوێنیتەوە .

پێنجەم : لەبەر لاوازی توانای ماددی خەڵاتەکان تەنها کتێب دەبێت و بریتین لە (١٥) خەڵات و هەر یەکی (پێنج) کتێب.

هەر بەڕێزێکیش پێی خۆشە بەشدار بێت لە دابینکردنی خەڵاتەکان دەتوانێت پەیوەندیمان پێوە بکات بۆ ئەوەی خەڵاتەکان بکەین بە (٣٠) خەڵات .

ئەمەش ژمارەی پەیوەندی ٠٧٧٠١٥١٧٣٧٨

ئامانج لەم پێشبڕکێیە تەنها بردنەوەی خەڵات نیە بەڵکو بۆ زیاتر تێگەشتن و شارەزابوونە لە زانستی شەرعی کە ئەمەش باشترین خەڵات و دیارییە ، چونکە فێربوونی زانستی شەرعی و

ئەحکامەکانی دین گەورەترین و باشترین کردەوە و گوێڕایەڵیە بۆ خوای گەورە؛ هەروەک خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿وَمَا كَانَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةٗۚ فَلَوۡلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرۡقَةٖ مِّنۡهُمۡ طَآئِفَةٞ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ﴾ [التوبة:١٢٢] . واتە : با باوەڕداران هەموویان دەرنەچن بۆ جیهاد ،گەر لەهەر کۆمەڵێکیان چەند نەفەرێکیان بمێننەوە و فێری دینی خودا ببن .

وە ئەو کەسانەی کە شەرعناس وشارەزان زیاتر لە خوای گەورە دەترسن وپلەو پایەیان لە کەسانی تری باوەڕداران بەرزترە لای خوای گەورە ، هەروەک خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖ﴾ [المجادلة:١١]

دەبینین لێرە خوای گەورە باوەڕدارن بە گشتی باسدەکات و ئەهلی عیلم بە تایبەتی.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: « مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ » رواه البخاري ومسلم.

واتە: ئەگەر خوا خەیر وچاکەی بۆ کەسێك بوێت، ئەوا شارەزای دەکات لە ئاینی ئیسلام.

وە (أبو الدَّرداء) خوای لێ ڕازی بێت دەفەرموێت: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: « مَن سَلَكَ طريقاً يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْماً سَهَّلَ اللهُ لَهُ بِهِ طَرِيقاً إلى الجَنَّة » حسنه الشيخ الألباني في صحيح الترغيب (٧٠). واتە: هەر کەسێك ڕێگایەك بگرێتە بەر بۆ بەدەست هێنانی زانستی شەرعی، ئەوا خوای گەورە بەو کارەی ڕێگایەکی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات.

**بەشداری کردن لەم جۆرە پێشبڕکێ یە بە نیەتی فێربونی زانستی شەرعی و شارەزابوون لە دینەکەت إن شاء الله دەبێتە هۆی ئاسانی ڕێگای بەهەشت .**

هاوڕێکانتان ئاگادار بکەنەوە با هەموان سودمەند بن

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضلّ له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله أما بعد:**

خوای گەورە و میهرەبان منەتی ناوە بەسەر بەندەکانیدا بە ڕەخساندنی چەندین وەرزی خواپەرستی، کە تێیدا چاکە چەند قات دەبێتەوە و تاوانی تێدا دەسڕێتەوە و پلەوپایەی تێدا بەرزدەبێتەوە، جا لە گەورەترین ئەو وەرزانەی خواپەرستی بریتی یە لە **(مانگی پیرۆزی ڕەمەزان)** کە خوای گەورە فەرزی کردووە لەسەر بەندەکان و هانی داون لەسەری و ڕێنمایی کردوون لەسەر شوکر و سوپاس کردنی.

جا لەبەر ئەوەی ئەم عیبادەتە زۆر گەورە و مەزنە ، بۆیە دەبێت موسڵمانان ئەو حوکمانەی پەیوەستن پێوەی بیزانن و خۆیانی لێ شارەزا بکەن بۆ ئەوەی ڕۆژوو گرتنەکەیان لەسەر سوننەت و بێ کەموکورتی بێت ، بۆیە ئەم کتێبەی بەردەستت پوختەی ئەحکامەکانی ڕۆژووی تێدایە بەکورتی و هەروەها ئاداب و سوننەتەکانیشی.

وە پێش باس کردنی حوکم و ئادابەکانی ڕۆژوو دوو بابەتی گرنگمان داناوە سەبارەت بە بەرنامەیەکی تایبەت بە مانگی شەعبان و چۆنێتی پێشوازی لە مانگی ڕەمەزان.

داواکارین لە خوای گەورە ئەم کارەمان لێ وەربگرێت و بیکاتە توێشوی قیامەتمان و سودمەندیش بێ بۆ موسڵمانان .

ستافی ماڵپەڕی وەڵامەکان و کەناڵی بەکورتی

## بەرنامەیەکی تایبەت بەمانگی شەعبان

گەر موسوڵمان بزانێت و بیری خۆی بنێتەوە بەوەی مانگی شەعبان موژدەی هاتنی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزە ، ئەوا هیمەتی بەرز دەبێتەوە و هەست بەچوست وچالاکی دەکات، ومانگی شەعبان وەک ڕاهێنانێک وایە بۆ خۆ ئامادە کردن بۆ مانگی ڕەمەزان.

بۆیە گرنگە هەموو موسوڵمانێک لەم مانگەدا بەرنامەیەک بۆ خۆی دابنێت چونکە لەم مانگەدا کردەوەکان بەرز دەبنەوە بۆ لای خوای گەورە .

بۆ نموونە دەکرێت موسوڵمان بەرنامەیەک بۆ خۆی دابنێت و پەلە بکات لەجێ بەجێ کردنی دا ، وەک :

**یەکەم :** پەلە کردن لەتەوبە کردن وزۆر زیکر ویادی خودا کردن ، ئەمە یەکەم شتە موسوڵمان لەپێشوازی ئەم

مانگەدا ئەنجامی بدات ، بەڵکو دڵ وزمانی ڕابێنێت لەسەر یادی خودا وئاسان بێت لەسەری .

دووەم : زۆر قورئان خوێندن بەشێوەیەک بەرنامەیەکی ڕۆژانە بۆ خۆی دابنێت ولێی دوا نەکەوێت ، وبا جوزئێک یاخود زیاتر بێت ئەوەندەی کەلەسەری ئاسانە ، وگرنگە لەگەڵ ئەوەشدا تەماشای هەندێ تەفسیر بکات بەتایبەت ئەو تەفسیرانەی جێی سقەن ونوسەرەکانیان ئەهلی عیلم وسوننەتن ، بەڵکو یارمەتیدەری بێت لەتێگەیشتن لەو ئایەتانەی کەتێگەیشتن لێیان قورسە ، ئەمەش لەپێناو ئەوەی کاتێ ڕەمەزانی بەسەردا دێت تەواو ئامادە بێت وچوست وچالاک بێت.

سێیەم : پەلە کردن لەسوڵح کردن و لێ خۆش بوون لەو کەسانەی کەنێوانیان تێک چووە ، و با ئەم فەرموودەیەیی

پێغەمبەر ﷺ بیری خۆی بخاتەوە : " تُفْتَحُ أَبْوابُ الجَنَّةِ يَومَ الإثْنَيْنِ، ويَومَ الخَمِيسِ، فيُغْفَرُ لِكُلِّ عَبْدٍ لا يُشْرِكُ باللَّهِ شيئًا، إلَّا رَجُلًا كانَتْ بيْنَهُ وبيْنَ أخِيهِ شَحْناءُ، فيُقالُ: أنْظِرُوا هَذَيْنِ حتَّى يَصْطَلِحا، أنْظِرُوا هَذَيْنِ حتَّى يَصْطَلِحا، أنْظِرُوا هَذَيْنِ حتَّى يَصْطَلِحا ".واتە: هەموو دوو شەممان وپێنج شەممانێک دەرگای بەهەشت دەکرێنەوە ، خودا لەهەموو کەسێک خۆش دەبێت کەهاوبەشی بۆ خودا بڕیار نەدابێت جگە لەکەسێک نەبێت کەلەنێوان خۆی وبراکەیدا ناخۆشیەک هەیە ، وپێیان دەڵێت: چاوەڕێی ئەو دووە بکەن تاوەکو سوڵح دەکەن ، چاوەڕێی ئەو دووە بکەن تاوەکو سوڵح دەکەن .

لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ( ينزلُ ربُّنا إلى سماءِ الدُّنيا ليلةَ النِّصفِ مِن شعبانَ فيغفرُ لأهلِ الأرضِ إلَّا مُشرِكٍ أو مُشاحنٍ)

واتە: خوای پەروەردگارمان لە شەوی نیوەی شەعبان دائەبەزێ بۆ ئاسمانی دونیا ـ دابەزینێك كە شایستەی زاتی موبارەكی بێ ـ و لە گوناهی هەموو كەسێك خۆش دەبێت جگە لە كەسانێك نەبێت كە هاوەڵ بۆ خوا بڕیار دەدەن، یان كە سانێك ڕقەبەرایەتیان لە نێواندا هەبێ .

**چوارەم** : ڕاهێنانی دەروون لەسەر ڕۆژوو وچاوەڕێی پاداشت كردن لەخودا ، وبیری خۆ خستنەوەی ئەو عیبادەتانەی كەپشت گوێی خستوون ، وەهەروەها خێر و چاكە و سیلەی ڕەحم، و هاریكاری كردنی كەسانی موحتاج.

**پێنجەم** : شەو نوێژ كردن ، ونزیک بوونەوە لەخودا ودوعا كردن بەوەی خودا بیگەیەنێتە ڕەمەزان ، چەندان كەس مردن دەبێتە ڕێگر لەوەی بگەن بەڕەمەزان وئەجەل یەقەیان دەگرێت!

شەشەم: موحاسەبە کردنی نەفس وبیر هێنانەوەی خۆی بەوەی تاوانی ئەنجام داوە بەڵکو زوو تەوبە بکات .

**تێبینی : ئەو کەسانەی کە قەرزی ڕۆژویان لەسەرە :**

هەر کەسێک ڕۆژووی قەرزی ڕەمەزانی ڕابردووی لەسەرە پێویستە پەلە بکات لەگرتنەوەیی ودروست نی یە بەبێ عوزر دوای بخات بۆ دوای ڕەمەزان ، عائیشە خوای لێ ڕازی بێت دەڵێت: "كان يكون عليَّ الصومُ من رمضان، فما أستطيعُ أن أقضيَه إلاَّ في شعبان؛ وذلك لمكانِ رسول الله صلَّى الله عليه وسلَّم" رواه مسلم.

واتە: جاری وا بووە ڕۆژووی ڕەمەزانم لەسەر بووە وقەرزدار بووم ، ونەم دەتوانی قەزای بکەمەوە تەنها لەمانگی شەعباندا نەبێت ، ئەوەش لەبەر سەرقاڵبون بە خزمەتکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ .

**لە کۆتاییدا :**

برا و خوشکانی موسڵمان : بزانن کە ڕۆژەکانی ژیانمان بەرەو کۆتا دەچن ، وساتەکانی ژیانمان بەرەو نەمان دەچن ، بۆیە پێش لەدەست چوونی کارێک پێش خۆتان بخەن ، و ئەمە هەل ودەستکەوتێکە ولەکیسی خۆتانی مەدەن ، گوێ مەدە بە برسێتی و ماندوێتی ، چونکە تۆ ئومێدی حەوانەوە و ژیانی ئەبەدی نێو بەهەشتی نەبڕاوەت هەیە .

وە هەمیشە ئەمە بخە پێش چاوت کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی مانگی شەعبان فەرمویەتی : (وهو شهْرٌ تُرْفَع فيه الأعْمال إلى ربِّ العالمين) واتە : ئەوە مانگێکە کردەوەکان تیایدا بەرز دەبێتەوە بۆ لای پەروەردگار .

جا بێنە پێش چاوی خۆت گەر بەپیاوێک بوترێت: دەسەڵاتدارێک کردەوەکانت دەبینێت وپاداشتت دەداتەوە

لەسەری ، ئایا هەموو هەوڵی خۆی ناخاتە گەڕ بەڵکو بەجوانترین شێوە کارەکەی ئەنجام بدات ؟!

ئەی چ دەڵێیت: گەر بینەر وچاودێری کاری ئەو کردەوەکانە خودای جیهانیان بێت ئەو خودایەی کەهەرگیز ستەم ناکات وهیچ شتێکی لێ ون نابێت لەئەرز بێت یاخود ئاسمان؟!

نسألُ اللهَ العَلي القدير أنْ يتوبَ علينا، وأن يجعلَنا من أهل الطاعات، وأن يرزقَنا الجنةَ، وما يقرِّبُ إليها من قَوْل وعمل، ويباعدَنا عن النار، وما يقرِّب إليها من قوْل أو عمل.

وصلِّ اللهم على نبيِّنا محمد وعلى آله وصَحْبه وسلِّم.

## چۆن پێشوازی لە مانگی ڕەمەزان بکەین ؟

بێ گومان هەر هەمووومان کە میوانێکمان دێت چەند ڕۆژێك پێشوەخت تێ ئەفکرین بۆ ئەوەی چۆن بێشوازی لەو میوانە بکەین، جاری واش هەیە نازانین ئەو میوانە شایستەی ئەو ڕێز و ماندو بوونەیە ؟ باش بێت یان خراپ لە ئەنجامدا بۆ مرۆڤێکی ئەکەین، ڕاستە منیش پێم وایە مرۆڤ جێگای ڕێزگرتنە بەڵام کاممان بە هەفتەیەك بیرمان کردۆتەوە و لە خۆمان پرسیوە ئایا چۆن پێشوازی لەو میوانە بەڕێزە بکەین کە ساڵی یەك جار سەردانمان ئەکات ؟ کە ئەویش مانگی پیرۆزی ڕەمەزانە ؟

پرسیارێکە و زۆربەمان خۆمانی لێ ئەدزینەوە لەکاتێکدا (معلی) ی کوڕی (فضل) ئەڵێت: پیاوچاکانی پێشین مانگێ بەر لەهاتنی ڕەمەزان لەخوا ئەپاڕانەوە کە خوای گەورە

بیانگەیەنێتە مانگی ڕەمەزان (ئەمەش بۆ ئەوەی بەرنامەیەکی خواپەرستی دابنەن و گرنگی بەکاتەکانیان بدەن بۆ ئەوەی خوای گەورە لە خۆیان ڕازی بکەن و زۆرترین عیبادەتی تێدا ئەنجام بدەن بۆ ئەوەی ببن بە یەکێک لەو کەسانەی کە خوای گەورە لێخۆشبونی یەکجارییان بۆ دەربکات )

ئەی تۆ دەتەوێ چۆن پێشوازی لەم میوانە بکەی؟

چ پلان و بەرنامەیەکت هەیە بۆ مانگی ڕەمەزان؟

دەتەوێ بزانی چۆن کاتەکانت ڕێک بخەیت ؟

دەتەوێ بەرنامەیەکی خواپەرستیت پیشان بدەین؟

دەتەوێ ئەم ڕەمەزانەت جیاواز بێت لە ڕەمەزانەکانی پێشووت؟

فەرموو ئەم بابەتەی لاپەڕەی دواتر بخوێنەوە

## چۆن بتوانم کاتەکانم ڕێک بخەم و بەرنامەیەک دابنەم بۆ مانگی ڕەمەزان؟

١- هەستان بۆ پارشێو و فەرامۆش نەکردنی: چونکە پێغەمبەرمان فەرمویەتی: (پارشێو بکەن چونکە بەڕاستی لە پارشێوکردندا بەرەکەت هەیە). متفق علیه

٢- زۆر گوتنی(استغفر الله) لە کاتی پارشێودا تاکو بانگی بەیانی چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ١٨ ﴾

٣- ئەنجامدانی دووڕکات سونئەتی پێش نوێژی بەیانی، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێت: (رَكْعَتَا الفَجْرِ خَيرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَما فِيهَا) (رواه مسلم). واتە : دوو ڕکاتی سونئەتی بەیانی خێرترە لەدنیاو هەرچیش لەدنیادایە

تێبینی : ئەم دو ڕکاتە دوای بانگی بەیانی دەکرێ نەک پێشی

## بانگی بەیانی

١- زو چون بۆ نوێژی بەیانی بۆ مزگەوت.

٢- سەرقاڵبون بە زیکرو دوعاوە تاکو کاتی قامەت کردن بۆ نوێژی بەیانی.

٣- مانەوە لەمزگەوتدا دوای ئەنجامدانی نوێژ بەیانی و بۆ خوێندنی قورئان و زیکرەکانی بەیانیان تاکو کاتی خۆرهەڵات ، چونکە پێغەمبەرمان ﷺ کاتێك کە نوێژی بەیانی دەخوێند دادەنیشت لە شوێنی خۆیدا و دەمایەوە تاکو کاتی ڕۆژهەڵاتن .(رواه مسلم).

٤- ئەنجامدانی دوو ڕکات نوێژ(نوێژی زوحا).

٥- پاڕانەوە کە خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ئەو ڕۆژەتەوە.

٦- نوستن و پشوودان و چاوەڕێی پاداشت کردن لەسەر ئەو نوستنە: چونکە (معاذ رضي الله عنه) فەرمویەتی: (لأحتسب نومتي كما احتسب قومتي)

٧- پاشان هەستان و چون بۆ خوێندن یان بۆ ئیشەکەت.

٨- سەرقاڵ بون بە زیکرەوە هەموو ڕۆژەکەت.

## نیوەڕۆ

١- چون بۆ نوێژی نیوەڕۆ و ئەنجامدانی بە جەماعەت لە مزگەوتدا لەگەڵ سونەتەکانی پێش و پاش نیوەڕۆ.

٢- پشوو دانێکی کەم لەگەڵ چاوەڕوانی پاداشت لەسەری چونکە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێت: لاشەت حەقی هەیە لەسەرت .

## عەسر

١ - ئەنجامدانی نوێژی عەسر بەجەماعەت لە مزگەوتدا، و هەوڵدان کە چوار ڕکات نوێژی سوننەت لە پێشیدا بکەیت.

٢- گوێگرتن لە ئاموژگاری مامۆستای مزگەوت.

٣-دانیشتن لە مزگەوت و خوێندنی زیکرەکانی ئێواران.

## مەغریب

١- سەرقاڵ بون بە دوعای پێش خۆرئاوابون چونکە دوعا لەو کاتەدا گیرا دەبێت و ڕەد ناکرێتەوە .

٢- شکاندنی ڕۆژوو و دوعا کردن: کە بریتیە لە گوتنی:

(ذهَب الظَّمأُ، وابتَلَّتِ العُروقُ، وثبَت الأجرُ إن شاء اللهُ ) .

٣- ئەنجامدانی نوێژی مەغریب لە مزگەوتدا.

٤- ئەنجامدانی دوو ڕکات سوننەت دوای مەغریب.

٥- خۆ ئامادەکردن بۆ چون بۆ نوێژی تەراویح.

## عیشا

١ - ئەنجامدانی نوێژی عیشا لە مزگەوت بەجەماعەت.

٢- ئەنجامدانی نوێژی تەراویح بەتەواوەتی لەگەڵ ئیمامدا .

---

## چۆن لە ڕەمەزاندا زیاتر لە خەتمێک دەکەی؟

| ژمارەی خەتمەکان | خوێندنی ڕۆژانە بە لاپەڕە | خوێندنی لاپەڕەکان دوای هەموو نوێژێک |
|---|---|---|
| ١ خەتمە | ٢٠ لاپەڕە | ٤ لاپەڕە |
| ٢ خەتمە | ٤٠ لاپەڕە | ٨ لاپەڕە |
| ٣ خەتمە | ٦٠ لاپەڕە | ١٢ لاپەڕە |
| ٤ خەتمە | ٨٠ لاپەڕە | ١٦ لاپەڕە |
| ٥ خەتمە | ١٠٠ لاپەڕە | ٢٠ لاپەڕە |

ئێستاش دێینە سەر باسی حوکم و ئادابەکانی ڕۆژوو لە (١٠٠) خاڵدا .

## پێناسەی ڕۆژوو

١ - **ڕۆژوو لە ڕووی زمانەوە بریتیە لە:** خۆگرتنەوە .

**لەڕووی شەرعیشەوە بریتیە لە:** خۆگرتنەوە لەو شتانەی کە ڕۆژوو دەشکێنن لە بانگی بەیانی یەوە هەتاوەکو ئاوابوونی خۆر (بانگی مەغریب) لەگەڵ نیەت.

## حوکمی ڕۆژوو

٢ - زانایانی ئوممەت یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان فەرزە، و ئەو کەسەی بەبێ عوزر بەشێك لە ڕەمەزان نەگرێت ئەوا تاوانێکی گەورەی ئەنجام داوە ، هەرکەسێکیش باوەڕی بە فەرزێتی ڕۆژوو نەبێت ئەوا بێباوەڕە .

## فەزڵی ڕۆژوو

**٣ - لە فەزڵەکانی ڕۆژوو :** خوای گەورە تایبەتی کردووە بەخۆیەوە بەوەی هەر خۆی پاداشتی خاوەنەکەی دەداتەوە و پاداشتی بۆ چەندقات دەکاتەوە ، وە دوعای ڕۆژوەوان ڕەد ناکرێتەوە، وە ڕۆژووەوان دوو ساتی خۆشحاڵ بوونی بۆ هەیە، وە ڕۆژوو و قورئان شەفاعەت بۆ خاوەنەکەی دەکەن لە ڕۆژی قیامەتدا، وە بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لای خوای گەورە خۆشترە لە بۆنی میسك، وە ڕۆژوو پارێزەرە و قەڵغان و قەڵایە بۆ خاوەنەکەی کە لەئاگر دەیپارێزێت، وە هەرکەس لەپێناوی خوادا ڕۆژێك بەڕۆژو بێت ئەوا خوای گەورە بەهۆیەوە ئەو کەسە حەفتا ساڵ لەئاگری دۆزەخ دوور دەخاتەوە، وە لەبەهەشتدا دەرگایەك هەیە پێی دەوترێت دەرگای " **ڕەیان** " کە تەنها ڕۆژوەوان لێی دەچنە ژوورەوە.

**سەبارەت بە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانیش** ئەوا پایەیەکە لە پایەکانی ئیسلام، و قورئانی پیرۆز لە مانگی ڕەمەزاندا دابەزیوە، و شەوێکی تێدایە عیبادەت کردن تێیدا خێرتر و باشترە لە هەزار مانگ، وە کە مانگی ڕەمەزان دێت دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە و دەرگاکانی دۆزەخیش دادەخرێن و دەبەسترێن، و شەیتانەکانیش بەند و زنجیر دەکرێن، و مانگی سڕینەوەی تاوانەکانە ، مانگی ڕزگار بوونە لەئاگری دۆزەخ ، بەڕۆژووبوونی ڕەمەزان یەکسان و بەرانبەرە بە ڕۆژووبوونی دە مانگ.

## لە سوودەکانی ڕۆژوو

**٤ – لە ڕۆژوودا چەندین حوکم وسوودی زۆر هەیە کە بەدەوری تەقوادا دەسوڕێتەوە،** چونکە ڕۆژوو سەر دەکێشێت بۆ تێکشکاندنی شەیتان و کزکردن و لاوازکردنی شەهوەت، و پاراستنی ئەندامەکان، و ئیرادە بەهێز دەکات لەسەر دوورکەوتنەوە لە شوێنکەوتنی هەوا و ئارەزوو و دوورکەوتنەوە لە سەرپێچی و تاوان، تۆوی ڕەحمەت و بەزەیی لە هۆش و ویژدان و دڵەکانمان ئەنێژێ و فێری ئارامگرتنمان ئەکات ، وە وامان لێدەکات هەردەم هەژارانمان لە یاد بێت و دەستی یارمەتیان بۆ درێژ بکەین ، وە دڵەکانمان نەرم ئەکا و گوێیەکانمان ڕائەهێنێ بۆ زیاتر گوێگرتن لە قورئان و ئامۆژگاری ، هەروەها ڕاهێنانە لەسەر ڕێککاری و وردی لە کات و فێربوونی پرەنسیپی یەکڕیزی موسڵمانان.

## ئادابە کانی ڕۆژوو و سوننەتە کانی

**٥ – لەو ئادابانە هەیە واجبە و هەشە سوننەتە، وەکو:**

- سور بوون لەسەر پارشێوکردن چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : " فَصْلُ مَا بَيْنَ صيامِنَا وَصيامِ أَهْلِ الكِتابِ : أَكْلَةُ السُّحُرِ " واتە : جیا کەرەوەی ڕۆژووی ئێمە و ڕۆژووی ئوممەتانی خاوەن پەڕتوك ( أهل الكتاب ) : خواردنی پارشێوە .
- خوای پەروەردگار و فریشتەکانی صەڵاوات دەدەن لەسەر ئەو کەسانەی پاشێو دەکەن :

لەوانەیە گەورەترین بەرەکەتی پارشێو ئەوە بێ کە ڕۆژووانان لێ خۆشبوونی خوای پایە بەرز دەیانگرێتەوە ، وە هەروەها فریشتەکانی ئەو خوا میهرەبان و بەڕەحمە دەپاڕێنەوە و داوای لێ خۆشبوونیان بۆ دەکەن ، بۆ ئەوەی لە کۆمەڵی ڕزگار بووانی خوا بژمێررێن لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا .

له (أبو سعيد الخدری)ەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە فەرموویەتی : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : " السُّحُورُ أكْلَةٌ بَرَكَة ، فَلا تَدْعُوهُ ، وَلَو أنْ يَجْرَعَ أحَدُكُم جُرْعَةً مِنْ مَاءٍ ، فَإنَّ اللهَ ، وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلى المُتَسَحِّرِينَ "

واتە : پارشێو کردن خواردنێکی بە بەرەکەتە ، نەکەن لە دەستی بدەن ، ئەگەر بە خواردنەوەی قومێك ئاویش بۆ بێ ، چونکە خوای پەروەردگار و فریشتەکانی صەڵاوات دەدەن لەسەر ئەو کەسانەی پارشێو دەکەن . بۆیە پێویستە هیچ موسوڵمانێك ئەم پاداشتە گەورەیەی خوای بەڕەحم و میهرەبان لە دەست نەدات .

• وە حوکمی پارشێو کردنیش ئەوەیە کە سوننەتە ، وە سوننەت وایە پارشێو دوا بخرێت بۆ کەمێك پێش بانگی بەیانی و دەرکەوتنی فەجری ڕاستەقینە ، نەک یەک سەعات و زیاتر پێش بانگ پارشێو بکەی .

• پەلەکردن لە ڕۆژوو شکاندن لەبەر فەرموودەی: (لا يَزَالُ النَّاسُ بخَيرٍ ما عَجَّلُوا الفِطْرَ) (متفق عليه). واتە: خەڵکی بەردەوام لەخێردان مادام پەلە دەکەن لە ڕۆژوو شکاندندا.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژووی دەشکاند پێش ئەوەی نوێژ بکات بەچەند خورمایەکی شل، و ئەگەر نەبوایە ئەوا خورمای وشك، و ئەگەریش نەبوایە ئەوا بەئاو خواردنەوە دەیشکاند، و لەدوای ڕۆژوو شکاندنەکەش دەیفەرموو: (ذهَبَ الظمأُ، وابتَلَّتِ العُروقُ، وثبَتَ الأجْرُ إنْ شاء اللهُ) (حسن - أبوداود) واتە: تینوێتی ڕۆیشت و دەمارەکان تەڕبوونەوە و پاداشتەکەش جێگیر بوو ئەگەر خوا ویستی لێ بێت.

• وە دوور **کەوتنەوە لە قسەی نابەجێ** و کەوتنە ناو تاوان و سەرپێچیەوە.

• **جا ئەوەی دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی خێر و چاکەکان** و هێنانی خراپە و تاوان بریتی یە لە سەرقاڵبوون بە زنجیرە فیلمەکان و توپی پێ و دانیشتنی بێهوودە و کات بەسەربردن بەشتی نارەواوە لەتۆڕە کۆمەڵایەتیەکان و مانەوە لەسەرە ڕێگاکاندا بەبێ سوود.

• **زۆر نەخواردن** لەبەر فەرموودەی: (ما ملأَ ابنُ آدمَ وعاءً شرًا مِنْ بطنٍ..) (صحيح -رواه الترمذي) واتە: ئادەمیزاد هیچ قاپێکی پڕنەکردووە خراپتر لە ورگ و گەدە...

• **بەخشین و خێر و صەدەقە کردن**، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشندەترین کەس بووە لەخێردا و بەتایبەت لە ڕەمەزاندا.

## ئەوەی دەبێت ئەنجام بدرێت لەم مانگە گەورەیەدا

- **ئامادەسازی و دروست کردنی بارودۆخ بۆ عیبادەت** و پەلەکردن لە تۆبە و پەشیمانی وخۆشحاڵ بوون بەهاتنی مانگی ڕەمەزان و بەڕۆژووبوون و خشوع دروست بوون لەنوێژدا و ئامادەبوون لە تەراویح و سارد نەبوونەوە لە دە شەوی ناوەڕاستدا و گەڕان بەدوای شەوی قەدردا وصەدەقەکردن و ئیعتیکاف و مانەوە لە مزگەوتدا.
- **هیچی تێدا نییە ئەگەر پیرۆزبایی بکرێت بەبۆنەی هاتنی مانگی ڕەمەزانەوە** و پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی هاتنی مانگی ڕەمەزانی بەهاوەڵانی دەدا و هانی دەدان بۆ خۆ ئامادە کردن بۆی.

## جۆر و حوكمەكانی ڕۆژوو

**٦ – ڕۆژووی فەرز** وەكو ڕۆژووی ڕەمەزان ، **ڕۆژووی واجب** وەكو ڕۆژوی كەفارەتی كوشتنی بەهەڵە و ڕۆژوی كەفارەتی جیماع كردن لە ڕۆژی ڕەمەزان و جگە لەویش.

وە **ڕۆژووی نەزر** ئەم جۆرە لە ئەسڵدا واجب نی یە بەڵام مرۆڤ خۆی لەسەر خۆی واجبی دەكات ، وە **ڕۆژووی سوننەت** ، وەكو شەشەڵان و عەرەفە و نۆمینەی حاجیان و دوو شەممان و پێنج شەممان ....

**٧ – ڕۆژوی سوننەت** دەبێتە هۆی پڕكردنەوەی كەموكورتیەكانی ڕۆژوی فەرز.

**٨ – نەهی هاتووە لەسەر گرتنی ڕۆژوی هەینی بەتەنها و هەروەها ڕۆژی شەممەش** جگە لە فەرز و بەڕۆژوبونی هەموو ڕۆژێك و دوو ڕۆژ بەڕۆژو بوون

بەسەریەکەوە کە پێی دەوترێت " الوصال" و هەروەها بەڕۆژوبوون لە ڕۆژانی جەژنی قوربان و ڕەمەزان و ڕۆژانی تەشریقیش حەرامە وەهەروەها (یوم الشک) کە بریتیە لە سی یەم ڕۆژی مانگی شەعبان.

## دڵنیابوون لە هاتنی مانگی ڕەمەزان

**٩ – هاتنی مانگی ڕەمەزان بە بینینی مانگ سابت دەبێت** هەرچەند تەنها کەسێکیش بینیبێتی بەمەرجێك ڕاستگۆ و جێی سیقە و عادل بێت ، یان بە تەواوکردنی سی ڕۆژی شەعبان ، و کارکردن بە سیستەمی فەلەکی و حسابات بۆ زانینی هاتنی مانگ بیدعەیە.

**پرسیارێک :** گەر لە سعودیۆ مانگ بینرا بەڵام لە وڵاتێکی تر نەبینرا ئایا واجبە هەموی بە ڕۆژوو بیۆ؟

**وەڵام :** ئەمە لە ڕووی گەردوونیەوە مەحاڵە، چونکە کاتی دەرچوونی مانگ وەکو شێخ الإسلام ابن تیمیە – رحمەالله- دەڵێت دەگۆڕێت بە یەکدەنگی شارەزایانی ئەم بوارە، جا کەوابوو ئەوە کرۆکی بەڵگەی شەرعی و عەقڵیش وا دەخوازن کە هەر وڵاتە و حوکمی خۆی هەبێت.

وه( هيئة كبار العلماء ) ڕوونكردنەوەيەكی گرنگيان داوه لەم بارەيەوه و له ئەنجام دا گەشتنه ئەوەی كه :

مادام ئەم بابەته لەكۆن ونوێدا خيلافی لەسەر بووەو نابێته هۆكاری شتی خراپ ، ولەماوەی چوارده سەدەدا نەبينراوه ئومەتی ئيسلامی كۆ دەنگ بن لەسەر يەك بينين، بۆيه پێيان وايه:

ئەم بابەته وەك خۆی بهێڵدرێتەوه وئيساره نەكرێت ، و هەريەك له وڵاتان مافی هەڵبژاردنی ئەوەی هەبێت كه بەگونجاوی دەزانێت لەڕێگای زانايانيانەوه كام لەو دوو بۆ چوونه هەڵبژێرن ، چونكه هەردوو بۆ چوونەكه بەڵگەی خۆيان هەيه وپشتيان پێ بەستووه .

## ڕۆژو لەسەرکێ واجبە

**١٠ – ڕۆژو واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێکی باڵغی** ژیری نیشتەجێی و بەتوانای سەلامەت لەڕێگرەکانی وەکو حەیز و نیفاس.

**١١ – منداڵ لە حەوت ساڵیەوە فەرمانی پێ دەکرێت** بە ڕۆژوو ئەگەر توانی، و هەندێ لە زانایان باسی ئەوەیان کردووە کە لەتەمەنی دە ساڵی لێی دەدرێت ئەگەر نەیگرت.

**١٢ – ئەگەر کافر موسڵمان بوو یان منداڵ باڵغ بوو** یان شێت ژیربوویەوە و بەهۆش هاتەوە لە کاتی ڕۆژدا ئەوا دەبێت ئەوەی ماوە لە ڕۆژەکە خۆیان بگرنەوە لە خواردن و خواردنەوە و قەزای ئەو ڕۆژە و چەندێکیانیش لەدەست چووە لە ڕەمەزان لەسەر نییە.

**١٣ – بەخشراو (شێت) قەڵەمی نووسینی تاوانی لەسەرهەڵگیراوە،** بەڵام ئەگەر ئەو حاڵەتەی ناوبەناو بۆ دەهات ئەوا ئەو کاتەی کە لەسەر هۆشی خۆیەتی و ئاساییە دەبێت ڕۆژو بگرێت و بەهەمان شێوە ئەو کەسەش کە پەرکەمی هەیە.

**١٤ – هەر کەس لە مانگی ڕەمەزاندا بمرێت ئەوا** قەزاکردنەوە لەسەر خۆی و میراتگرەکانی نییە لەوەی ماوە لە مانگەکە.

**١٥ – هەرکەس نەیزانی کە ڕۆژووی ڕەمەزان واجبە** یاخود نەیزانی خواردن و جیماع کردن حەرامە، ئەوا زۆرینەی زانایان لەسەر ئەوەن کە عوزرەکەی پەسەندە و وەردەگیرێت، بەڵام ئەو کەسەی کە لەنێو موسڵماناندایە و دەتوانێت پرسیار بکات و فێربێت ئەوا عوزری بۆ نییە.

## بەڕۆژووبوونی ڕێبوار

**١٦ – مەرجە بۆ ئەوەی لەسەفەردا بەڕۆژوو نەبێت:**

دەبێت سەفەرەکە دووریەکەی لەڕووی شەرع و عورفەوە پەسەند بێت واتە ئەوەی بینابێت و سەربەو شارە بێت ئەم تێی پەڕاندبێت ئەوەندە دوورکەوتبێتەوە و سەفەری تاوان و سەرپێچیش نەبێت (لای زۆربەی زانایان) و نابێت مەبەستیشی لەسەفەرەکەی خۆدزینەوە بێت لە ڕۆژووگرتن و بەکارهێنانی حیلە بێت.

**١٧ – بەیەکدەنگی زانایان دروستە بۆ ڕێبوار** بەڕۆژوو نەبێت، ئیتر توانای ڕۆژووی هەبێت یان نا، یاخود ڕۆژوو نارەحەتی بکات یان نا.

**١٨ – هەركەس نیەتی ڕۆژوو بوونی ڕەمەزانی هەبوو** ئەوا نیەتی بەڕۆژوو نەبوون ناهێنێت هەتا دەست بەسەفەرەكە نەكات، و ڕۆژووەكەی ناشكێنێت هەتا لەشار و ئاوەدانی دەرنەچێت و نەچووبێتە ناو سەفەرەكەیەوە.

**١٩ – ئەگەر خۆرئاوابوو ئەمیش ڕۆژووی شكاند لەسەر زەوی،** پاشان سواری فڕۆكە بوو ، و فڕۆكەكە بەرزبوویەوە و خۆری بینی، ئەوا لەسەری نییە خۆی بگرێتەوە لەخواردن چونكە ڕۆژووی ڕۆژێكی بەتەواوی گرتووە.

**٢٠ – هەركەس گەیشتە شارێك و نیەتی مانەوەی تێدا هەبوو زیاد لەچوار ڕۆژ** ئەوا لای زۆربەی زانایان واجبە بەڕۆژوو بێت.

**٢١ – هەركەس بەڕۆژوو بوو لەشوێنی نیشتەجێ بوونی خۆی وپاشان سەفەری كرد** لە ڕۆژدا ئەوا دروستە بۆی ڕۆژووەكەی بشكێنێت.

**٢٢ – دروستە ئەو کەسە بەڕۆژوو نەبێت کە عادەتی سەفەرکردنە ئەگەر شاری خۆی هەبێت** کە بێتەوە بۆی، وەکو پۆستەچی و تەکسی و فڕۆکەوان و کارمەند ئەگەریش سەفەرەکەیان ڕۆژانە بێت و دواتر قەزایان لەسەرە، هەروەها دەریاوان ئەگەرماڵێکی هەبێت لە وشکانی کەبێتەوە بۆی وتێیدا نیشتەجێ بێت.

**٢٣ –ئەگەر ڕێبوار لەکاتی ڕۆژدا هاتەوە لە** سەفەرەکەی ئەوا چاکتر وایە خۆی بگرێتەوە لەبەر حورمەتی مانگەکە، بەڵام قەزای لەسەرە ئەگەر خۆی بگرێتەوە یان نا.

**٢٤ – ئەگەر بەڕۆژوو بوو لە شارێکدا وپاشان سەفەری کرد** بۆ شارێکی تر وپێش یان پاش ئەوان ڕۆژوویان گرتبوو ئەوا حوکمی ئەو شارە وەردەگرێت کە سەفەری بۆی کردووە.

## بەڕۆژوبوونی نەخۆش

**٢٥ – هەر نەخۆشیەك مرۆڤ لە حاڵەتی ئاسایی و ساغێتی دەربكات ئەوا دروستە بەڕۆژو نەبێت.**

بەڵام ناڕەحەتیەكی ئاسایی و كاتی وەكو سكچوون و سەر ئێشە ئەوا دروست نییە بەهۆیەوە ڕۆژوو نەگیرێت. ئەگەر سەلمێنرا بە زانستی پزیشكی یان نەخۆشەكە خۆی بەهۆی ئەزموون و گومانی زۆری خۆیەوە كە ڕۆژوگرتن نەخۆشی دەخات یان نەخۆشیەكەی زیاد دەكات یان چاك بوونەوەی دوادەخات ئەوا دروستە بۆی بەڕۆژوو نەبێت و بەڵكو مەكروهە بەڕۆژوویش بێت.

**٢٦ – ئەگەر ڕۆژوگرتن تووشی لەهۆشخۆچوونی دەكات ئەوا ڕۆژوو ناگرێت و بەقەزا دەیگرێتەوە،** بەڵام ئەگەر بەزمانی بەڕۆژووەوە لەڕۆژدا بوورایەوە پێش

خۆرئاوابوون بەهۆش خۆی هاتەوە ئەوا ڕۆژووەکەی تەواوە مادام بەڕۆژووەوە ڕۆژی کردەوە، بەڵام ئەگەر تووشی لەهۆشخۆچوون بوو هەر لە فەجرەوە هەتا خۆرئاوابوون ئەوا زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە ڕۆژووەکەی تەواو نییە. بەڵام قەزاکردنەوەی کەسی لەهۆشخۆچوو لای زۆربەی زانایان واجبە ئەگەر کات و ماوەی بوورانەوەکە زۆربوو.

**٢٧ – هەرکەس لەکاتی بەڕۆژووبووندا تووشی برسێتیەکی لەڕادەبەر یان تینوێتیەکی لەناوبەر بوو بەشێوەیەك لەگیانی خۆی دەترسا** یان گومانی ئەوەی بۆ دروست بوو کە هەندێ هەستی لەدەست بدات بەگومانی زۆری نەوەك تەنها وەهم و خەیاڵ، ئەوا دروستە ڕۆژووەکەی بشکێنێت و دواتر قەزای دەکاتەوە، و خاوەن کارە قورسەکان نابێت بەڕۆژوو نەبن، بەڵام ئەگەر وازهێنان لەکارەکەیان

زیانی پێ دەگەیاندن و لەگیانی خۆیان دەترسان لەڕۆژدا ئەوا بەڕۆژوو نابن و بەقەزا دەیدەنەوە ، وە هەروەها تاقیکردنەوەی خوێندکاران عوزر نییە بۆ بەڕۆژوو نەبوونی ڕەمەزان.

**٢٨ – ئەو نەخۆشەی کە ئومێدی چاکبوونەوەی لێ دەکرێت و چاوەڕێی شیفا دەکات ئەوا بەقەزا ڕۆژووەکەی دەداتەوە و خواردن دان لەبری بەڕۆژووبون دروست نییە بۆی.** بەڵام نەخۆشی درێژخایەن کە ئومێدی چاکبونەوەی لێ ناکرێت و پیرو بەساڵاچوو و پەککەوتە لەبری هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەدات کە نیو ساعە (کیلۆ و ڕوبعێک) لە خواردنی ئەو شارە کە ئێستا باشترین خواردنی زۆربەی خەڵکی گەر نەڵێین هەموو خەڵکی بریتی یە لە برنج.

**تێبینی : وتەی پەسەند ئەوەیە کە ئافرەتی دووگیان و شیردەر بە نەخۆش بەراورد دەکرێت** بۆیە دروستە بۆی بەڕۆژوو نەبێت و تەنها فیدیە دەدات.

**٢٩ – هەرکەس نەخۆش کەوت و پاشان چاکبوویەوە** و دەیتوانی بەقەزا ڕۆژووەکانی بگرێتەوە و نەیگرت هەتا مرد ئەوا لەماڵەکەی بۆ هەر ڕۆژێك خواردنی هەژارێك دەردەکرێت. و ئەگەر یەکێك لە کەسە نزیکەکانی حەزی کرد ڕۆژووی لەبر بگرێتەوە ئەوا دروستە و دەتوانێت.

## بەڕۆژووبونی بەتەمەن و پیر و بێ توانا

**٣٠ – پیر و بەساڵاچوو وپەککەوتە کە هێزیان نەماوە دەتوانن بەڕۆژوو نەبن مادام ڕۆژووگرتن نارەحەتە بۆیان.** بەڵام ئەو کەسەی کە تەمیزی لەدەستداوە و خەڵەفاوە و ئاگای لە خۆی نیە ئەوا تەکلیفی لەسەر نییە واتە نەڕۆژووی لەسەرە و نەهیچیش لەسەر کەسوکارەکەیەتی.

**٣١ – کەسێك سەرقاڵی کوشتاری دوژمن بێت یان** دوژمن ئابڵوقەی شاری دابێت و ئەمیش ڕۆژووگرتن لاوازی بکات، ئەوا بەبێ سەفەریش دروستە بۆی ڕۆژوو نەگرێت هەر وەکو چۆن پێش شەڕ و کوشتاریش پێویستی بە ڕۆژوو شکاندن هەبێت دەتوانێت.

**٣٢ – هەرکەس هۆکاری ڕۆژوو نەگرتنەکەی دیار و ئاشکرابوو وەکو نەخۆش** ئەوا دروستە بۆی بەئاشکرا بەڕۆژوو نەبێت و هەرکەسیش هۆکاری ڕۆژوو نەگرتنەکەی شاراوە بوو وەکو حەیز ئەوا باشتر و لەپێشترە بۆی کە ڕۆژوو نەگرتنەکەشی شاراوە بێت لەبەر تۆمەت بار نەکردنی و گومان پێ نەبردنی.

**بەپوختی :**

**أ. ئەوانەی کە تەنها قەزاکردنەوەیان لەسەرە بریتین لە :**

یەکەم: نەخۆشێك کە ئومێدی چاکبوونەوەی هەبێ.

دووەم: گەشتیار« موسافیر».

سێیەم: ئافرەتێك لە بێنوێژیدا بێ (سوڕی مانگانە).

چوارەم: ئافرەتێك لە زەیستانیدا بێ واتە خوێنی منداڵبون.

**ب.ئەوانەی تەنها فیدیەیان لەسەرە نەك قەزا بریتین لە :**

یەکەم و دووەم : پیرەمێرد ، و پیرەژن.

سێیەم: ئافرەتی حامیلە..

چوارەم: ئافرەتی شیردەر .

پێنجەم: نەخۆشی بەردەوام.

**ج. ئەوانەی کە قەزا کردنەوەی و کەفارەتیان لەسەرە :**

پیاوێکی بەڕۆژوو لە ڕۆژی ڕەمەزاندا جووت دەبێ لەگەڵ خێزانەکەی ، ئەوا دەبێ قەزاشی بکاتەوە و کەفارەتەکەشی بدات کە بریتیە لە ئازاد کردنی عەبدێک یان دوو مانگ ڕۆژوو گرتن یان نان دان بە شەست فەقیر.

## نیەت لە ڕۆژودا

**٣٣ – نیەت مەرجە لەڕۆژووی فەرزدا**، و لەهەموو ڕۆژوویەکی واجبیشدا، وەکو قەزا و کەفارەت، و نیەت لەهەر بەشێکی شەودا بێت دروستە با تۆزێك پێش فەجریش بێت.

**نیەتیش بریتی یە لە** بڕیاری دڵ لەسەر ئەنجامدانی کارێك، و بە دەم وتنی بیدعەیە ، وە لەگەڵ هاتنی مانگی ڕەمەزاندا یەکەم شەو دەتوانیٚ نیەتی هەموو مانگەکە بێنێت و دروستە و ئاساییە.

**٣٤ – ڕۆژووی سوننەت نیەتی شەوی پێویست نییە،** بەڵام سوننەتی دیاریکراو باشتر وایە لەشەودا نیەتی بۆ بهێنرێت.

**تێبینی** : ڕۆژوو دوو ڕوکنی هەیە کە بریتین لە :

أ. نیەت .

ب. خۆ گرتنەوە لەهەموو ئەو شتانەی ڕۆژوو دەشکێنن لەکاتی بانگی بەیانییەوە تاوەکو ئاوا بوونی خۆر.

**٣٥ – هەرکەس چووبوە ناو ڕۆژوویەکی واجبەوە وەکو** قەزا و نەزر و کەفارەت ئەوا دەبێت تەواوی بکات، و دروست نییە بەبێ عوزر بیشکێنێت. **بەڵام** ڕۆژووی سوننەت ئەوا کەسەکە ئازادە و ئەگەر ویستی تەواوی دەکات و ئەگەریش ویستی لێ بێت بەبێ عوزریش دەتوانێت بیشکێنێت.

**٣٦ – کەسێك نەیزانی مانگی ڕەمەزان هاتووە** هەتا دوای دەرچوونی فەجر ئەوا لەسەریەتی تەواوی ئەو ڕۆژە خۆی بگرێتەوە لەخواردن و خواردنەوە و لای زۆربەی زانایانیش قەزا کردنەوەی ئەو ڕۆژەی لەسەرە.

**٣٧ – کەسی بەندکراو ئەگەر زانی مانگی ڕەمەزان هاتووە لە تی ڤیەوە** یان کەسێکی متمانەپێکراو هەواڵی پێدا ئەوا واجبە ڕۆژوو بگرێت، ئەگینا خۆی هەوڵ دەدات کە بزانێت و گومانی زۆری بۆ چی چوو لەسەر ئەوە بڕیار دەدات.

## ڕۆژوو شکاندن و خۆگرتنەوە

**٣٨ – ئەگەر بازنەی خۆر ئاوابوو ئەوا ڕۆژووەوان ڕۆژووەکەی دەشکێنێت،** و مانەوەی سورایی دەمەو ئێوارە لە ئاسۆدا هیچ کاریگەری نییە.

**٣٩ – ئەگەر فەجر دەرچوو ئەوا واجبە ڕۆژووەوان دەست لە خواردن و خواردنەوە هەڵبگرێت دەستبەجێ ئیتر بانگ ببیستێت یان نا.** بەڵام خۆگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە (ئیمساک) لە پێش فەجر بە دە خولەك کەمتر یان زیاتر ئەوا بیدعەیە هەرچەند لە خشتەی کاتەکانی مانگی ڕەمەزانیش نوسرابێ یان لە مزگەوتەکانەوە بانگی بۆ بکرێ .

**٤٠ – ئەو وڵاتەی کە شەو و ڕۆژ** تێیدا بیست و چوار کاتژمێرە واجبە لەسەر موسڵمانانی ڕۆژوو بگرن با ڕۆژەکەشی درێژ بێت.

## ڕۆژوو شکێنەکان یان بەتاڵکەرەوەکانی ڕۆژوو

**٤١ – ڕۆژوو شکێنەکان جگە لە حەیز نیفاس ڕۆژوویان پێ بەتاڵ نابێتەوە مەگەر بە سێ مەرج نەبێت، ئەوانیش:**

**أ.** کەسەکە زانابێت پێی و نەفام نەبێت.

**ب.** ئاگای لەخۆبێت و بیری نەچووبێت.

**ج.** زۆرلێکراو نەبێت.

هەروەها بەشێکی تر لەو شتانەی کە ڕۆژوو بەتاڵ دەکاتەوە بریتین لە : جیماع و خۆڕشانەوە و حەیز و نیفاس و خواردن و خواردنەوە.

**٤٢ – بەشێکی تر لە ڕۆژوشکێنەکان لەبری خواردن و خواردنەوەن** وەکو چارەسەر وەرگرتن و دەرمان خواردن لەڕێگەی دەمەوە، و دەرزی موغەزی و دەرزی خوێن و

خوێن گواستنەوە، بەڵام ئەو دەرزیەی کە لەبری خواردن نییە و تەنها بۆ چارەسەرە و زیانی نییە ئەوا ڕۆژوو بەتاڵ ناکاتەوە، و وتەی پەسەندیش ئەوەیە کە قەترەی چاو و گوێ و دان هەڵکێشان و برین پێچی ( تەداوی ) و دەرزی پێدانی دەرمان لەڕێگەی کۆمەوە (حقنة الشرجية) هەموو ئەمانە ڕۆژوو بەتاڵ ناکەنەوە ، هەروەها سپرای یان بەخاخی ڕەبو لەگەڵ خوێن دەرکردن بۆ مەبەستی شیکاری و دەرمانی غەرغەرەش ئەگەر قووت نەدرێت. هەروەها ئەگەر کەسێك ددانی پڕکردەوە و هەستی بەتامەکەشی کرد لەگەروویدا ئەوا زیان بەڕۆژووەکەی ناگەیەنێت.

**٤٣ – هەرکەس بەئەنقەست لەڕۆژی ڕەمەزاندا شتی خوارد یان خواردەوە** ئەوا یەکێك لەتاوانە گەورەکانی ئەنجام داوە و لەسەریەتی تۆبە بکات و ئەو ڕۆژەش بەقەزا بداتەوە.

**٤٤ – ئەگەر بەبیرچوونەوەوە خواردی یان خواردیەوە ئەوا با ڕۆژووەکەی تەواوبکات**، چونکە ئەوە خوا خواردن و خواردنەوەی پێداوە، و ئەگەر بینی کەسێك دەخوات و لەبیری چووە دەبێت بیری بخاتەوە و نەهێڵێت.

**٤٥ – کەسێك پێویستی بە ڕۆژوشکاندن هەیە بۆ فریاکەوتن** و ڕزگارکردنی کەسێك لە تیاچوون ئەوا ڕۆژووەکەی دەشکێنێت و دواتر بە قەزا دەیگرێتەوە.

**٤٦ – هەرکەس ڕۆژووی لەسەری واجب بوو ، وە لە ڕۆژی ڕەمەزاندا جیماعی کرد لەگەڵ خێزانی بەئەنقەست و ئارەزوومەندانە ئەوا ڕۆژووەکەی شکاوە**، و تۆبەی لەسەرە و دەبێت ئەو ڕۆژەش تەواو بکات و کەفارەتیشی بدات و پاشان ئەو ڕۆژەش قەزا بکاتەوە، وە زینا و نێربازی و چوونە لای ئاژەڵیش هەمان حوکمیان هەیە.

**٤٧ – هەرکەس ویستی جیماع لەگەڵ خێزانیدا بکات و بۆ ئەو مەبەستە ڕۆژووەکەی شکاند واتە سەرەتا شتێکی خوارد ئەوجا جیماعی کرد ئەوا تاوانەکەی گەورەتر** و سەختترە، چونکە حورمەتی ڕەمەزانی دووجار شکاندووە بەخواردن و جیماعەکەی و کەفارەتەکەشی لەسەرە.

**٤٨ – ماچکردن و دەستبازی و باوەش پێداکردن و بەرکەوتن** و سەیرکردنی ڕۆژوەوان بۆ خێزانەکەی ئەگەر خۆی گرت ئەوا دروستە، بەڵام ئەگەر کەسەکە شەهوەتی خێرابوو بەشێوەیەك کە خۆی پێ نەدەگیرا ئەوا دروست نییە بۆی ئەو کارە ، وە ئەگەر بەهۆی ئەو ماچ و دەستبازیەوە مەنی هاتەوە ئەوا ڕۆژووەکەی دەشکێ و دەبێ قەزای بکاتەوە ، بەڵام کەفارەت و فیدیەی لەسەر نیە مادام جووت بون نەبێ .

**٤٩ – ئەگەر جیماعی دەکرد و فەجر دەرچوو لەو کاتەدا ئەوا دەبێت دەستبەجێ دەست هەڵبگرێت** و وازبهێنێت و ڕۆژووەکەشی تەواوە تەنانەت ئاویشی بێتەوە دوای وازهێنان، و ئەگەریش لەجیماع کردن هەر بەردەوام بوو تا دوای فەجر ئەوا ڕۆژوو ناگرێت و تۆبەی لەسەرە و دەبێت بەقەزا بیگرێتەوە و کەفارەتی لەسەرە.

**٥٠ – ئەگەر بەلەشگرانیەوە ڕۆژی کردەوە ئەوا زیانی بۆ ڕۆژووەکەی نییە**، بۆ نمونە پیاوێک شەو کاری سەرجێی لەگەڵ خێزانی دەکات ، یان ئافرەتێک شەو پاک دەبێتەوە لە سوڕی مانگانە دروستە غوسل دەرکردنەکەی دوابخات بۆ دوای فەجر و بانگی بەیانی، بەڵام دەبێت پەلە بکات لەبەر نوێژەکەی و پێش خۆرکەوتن دەبێ خۆی بشوات بۆ ئەوەی نوێژی بەیانی بکات.

**٥١ – ئەگەر ڕۆژووەوان خەوتبوو لەناو خەوەکەیدا لەشگران بوو** ئەوا ڕۆژووەکەی تەواو دەکات و ئەو خەو بینینە زیانی نیە بۆ ڕۆژووەکەی بەیەکدەنگی زانایان.

**٥٢ –** هەرکەس لە ڕۆژی ڕەمەزاندا (خوی نهێنی - دەسپەڕ) ئەنجام بدات و ئاوی خۆی بهێنێتەوە ئەوا واجبە تۆبە بکات و باقی ڕۆژەکە خۆی بگرێتەوە لەخواردن و خواردنەوە و ئەو ڕۆژەش بەقەزا بگرێتەوە.

**٥٣ – هەرکەس ڕشانەوە زۆری بۆی هێنا وڕشایەوە ئەوا قەزای لەسەر نییە**، بەڵام بەئەنقەست خۆی ڕشانەوە یان وای کرد کە بڕشێتەوە ئەوا ڕۆژوو دەشکێنیت، و ئەگەر ڕشانەوەکە خۆی هات وبەدەستی ئەم نەبوو ئەوا ڕۆژو ناشکێنێت. بنێشتیش لەبەر ئەوەی پارچەی لێ دەبێتەوە و تامی تری تێکەڵ دەکرێ ئەوا مژین و قووتدانی حەرامە و

ئەگەر بەشێك لەوە بگاتە گەروو ئەوا ڕۆژوو دەشكێنێت و قەزای لەسەرە، هەروەها بەڵغەم ئەگەر پێش ئەوەی بگاتە ناو دەم قووت بدرێت ئەوا ڕۆژوو ناشكێنێت بەڵام لەكاتی گەیشتنی بۆ نادەم ئەوجا قووت بدرێت ئەوا ڕۆژوو دەشكێنێت. وە مەكروهیشە تامی خواردن بكرێت بەبێ پێویست ، وە نابێ لەكاتی دەست نوێژدا موبالەغە و زێدەڕەوی بكات لە ئاوڕادەنەوە ناو دەم و لوتدا ، و ناشبێت لە ترسی ئەوەی ئاو بچێتە خوارەوە وازی لێ بێنێت و نەیكا.

**٥٤ – سیواك سوننەتە بۆ ڕۆژووەوان** لە هەموو ڕۆژەكەدا.

**٥٥ – ئەوەی تووشی ڕۆژووەوان دەبێت لە برین و خوێنی لووت بەربوون** یان ڕۆیشتنی ئاو یان بەنزین بۆ گەرووی بەبێ ئیختیاری خۆی ئەوا ڕۆژوو ناشكێنێت.

هەروەها دابەزینی فرمێسك بۆ گەرووی یان ڕۆن دان لەقژ و شوارب، یان خەنەبەکارهێنان و هەستکردن بەتامەکەشی لەگەروودا ڕۆژوو ناشکێنن، وە چاوڕەشتنیش ئاساییە بەهەمان شێوە هەتووان (مەرهەم)ی پێست نەرم و شێدارکردنیش ئاساییە و بۆن کردنی عەتر و بخوریش ئاساییە بەڵام وریابێت کە دووکەڵەکەی نەچێتە ناو قوڕگەوە.

**٥٦ – باشتر وایە بۆ ڕۆژوەوان کەڵەشاخ نەکات ،** چونکە ڕاجیاوازی زانایان لەسەر ئەو بابەتە زۆر توندە.

**٥٧ – جگەرەکێشان ڕۆژوو بەتاڵ دەکاتەوە** و عوزر نییە بۆ ڕۆژوو نەگرتن.

**٥٨ – نوقم بوون لەناو ئاودا یان خۆپێچانەوە** بەجلی تەڕ بۆ خۆ فێنک کردنەوە هیچی تێدانییە و ئاساییە بۆ ڕۆژوەوان.

**٥٩ – ئەگەر كەسێك وا گومانی برد كە هێشتا شەو ماویەتی و بانگی بەیانی نەداوە، بۆیە** شتی خوارد یان خواردەوە یان جیماعی كرد پاشان بۆی دەركەوت كە فەجر دەرچووە و بانگی داوە ئەوا هیچی لەسەر نییە.

**٦٠ – ئەگەر كەسێك ڕۆژووەكەی شكاند بەگومانی ئەوەی كە خۆرئاوابووە و بانگی داوە كەچی ئاواش نەبوو،** ئەوا لای زۆربەی زانایان قەزای لەسەرە.

**٦١ – ئەگەر كەسێك خواردن یان خواردنەوە لەناو دەمیدا بوو** لەو كاتەدا فەجر دەرچوو و بانگی بەیانی دا ئەوا بەیەكدەنگی زانایان قووتی دەدات و ڕۆژوەكەشی تەواوە.

## هەندێ لە حوکمەکانی بەڕۆژوبوونی ئافرەت

**٦٢ – ئەو ئافرەتەی کە باڵغ بووە وشەرمی کردووە** ئاشکرای بکات و بەو هۆیەوە ڕۆژووی نەگرتووە ئەوا دەبێت تۆبە بکات و قەزای ئەوەش بداتەوە کە نەیگرتووە لەگەڵ خواردندان بۆ هەر ڕۆژێك بەهەژارێك وەکو کەفارەتی دواخستنەکەی ئەگەر هاتوو تا ڕەمەزانی دواتر قەزای نەکردەوە. بەهەمان شێوە ئەو ئافرەتەی کە لەڕۆژانی عادەیدا (سوڕی مانگانە) لەبەر شەرم ڕۆژوی گرتووەو دواتر قەزای نەکردۆتەوە.

**٦٣ – ئافرەت جگە لە ڕۆژووی ڕەمەزان کە فەرزە نابێت ڕۆژووی سوننەت بگرێت ئیللا بە ئیزنی مێردەکەی** نەبێت، بەڵام ئەگەر مێردەکەی سەفەری کردبوو ئاسایيە.

**٦٤ – حەیزدار ئەگەر شلەی ئاوی سپی بینی لەدوای** حەیزەوە کە ئافرەت دەزانێت پاك بووەتەوە، ئەوا لەشەودا نیەتی ڕۆژوو دەهێنێت و دەیگرێت، بەڵام ئەگەر خۆی دەیزانی پاك نەبۆتەوە پەڕۆی یان لۆکەی پێدا دەهێنا و پاك بوو وەهیچی پێوە نەبوو ئەوا ڕۆژوو دەگرێت. حەیزدار و زەیسانی ئەگەر خوێنیان لیَ بڕا و بەشەو پاك بوونەوە ئەوا نیەتی ڕۆژوو دەهێنێت و فەجر دەرکەوت پێش ئەوەی خۆی بشوات ئەوا ڕۆژووەکەی تەواوە بە بۆچوونی تێکڕای زانایان.

وە هەر ئافرەتێک پێش خۆر ئاوابوون کەوتە سوڕی مانگانەوە و خوێنی حەیزی هات ئەوا ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێتەوە و دەبیَ دوای ڕەمەزان قەزای ئەو ڕۆژە بکاتەوە

**٦٥ – ئەو ئافرەتەی کە دەزانێت عادەکەی سبەینیَ** بۆی دێت ئەوا لەسەر نیەت و ڕۆژووگرتنەکەی بەردەوام دەبێت و نایشکێنێت هەتا خوێن نەبینێت.

**٦٦ – باشتر وایە ئافرەتی حەیزدار ڕازی بێت بەوەی خوا لەسەری نووسیوە و ئارامگر بێت لەسەر هاتنی ئەو خوێنە و هیچ دەرمانێک نەخوات بۆ ڕێگری کردن لە هاتنی** سوڕی مانگانەی.

**٦٧ – ئەگەر ئافرەتی دووگیان منداڵەکەی لەباربرد و** کەچی دەستی بەدروست بوون کردەوە ئەوا هەر وەکو زەیسانی وایە و ڕۆژوو ناگرێت، ئەگەرنا ئەوا حوکمی (مستحاضة)ی هەیە و ئەگەرتوانی ڕۆژوو دەگرێت. وە زەیسانی ئەگەر لە پێش چل ڕۆژیدا پاك بوویەوە ئەوا ڕۆژوو دەگرێت و نوێژدەکات، و ئەگەریش زیاد لە چل ڕۆژ بوو ئەوا نیەتی ڕۆژوو دەهێنێت و خۆی دەشوات و ئەو خوێنەی کەبەردەوامە وەکو (مستحاضة) تەماشا دەکرێت و زیانی نییە.

**٦٨ – خوێنی نەخۆشی (الاستحاضة) گاریگەری** لەسەر تەواوێتی ڕۆژوو دروست ناکات.

**٦٩ – وتەی پەسەند ئەوەیە کە ئافرەتی دووگیان و شیردەر بە نەخۆش بەراورد دەکرێت** بۆیە دروستە بۆی بەڕۆژوو نەبێت و تەنها فیدیە دەدات و قەزای لەسەر نییە ئیتر لەخۆی ترسا یان منداڵەکەی.

**٧٠ – ئەو ئافرەتەی کە ڕۆژووی لەسەر واجبە ئەگەر مێردەکەی لە ڕۆژی ڕەمەزاندا بەویست و ڕەزامەندی خۆی جیماعی لەگەڵدا کرد** ئەوا یەك حوکمیان هەیە و وەکو یەك وەهان، بەڵام ئەگەر زۆری لێکرا ئەوا هەوڵ دەدات نەیکات و ئەگەر دەسەڵاتی نەما و ناچارکرا ئەوا هیچی لەسەرنییە و کەفارەتی لەسەر نییە.

## نوێژی تەراویح

**٧١- نوێژی تەڕاویح سوننەتێکی تەئکید و جەخت** لێکراوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەقسە و کردار ئەنجامی داوە .

**٧٢- سەبارەت بە فەزڵی نوێژی تەراویح پێغەمبەری** خوا ﷺ فەرموویەتی: **(مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)** واتە: هەرکەس لەشەوانی ڕەمەزاندا شەو نوێژبکات باوەڕی پێی هەبێت و بەتەمای پاداشتی هەبێت لای خوای گەورە لە تاوانەکانی پێشووی دەبوررێت.

**٧٣- یەکەم شەوی دەست پێ کردنی نوێژی تەراویح**

بۆ نمونە : گەر وترا ڕۆژی هەینی یەکەم ڕۆژی ڕەمەزانە ، ئەوا ئێوارەی پێنج شەممە کە خۆر ئاوابوو ئەوا دەچینە ناو ڕەمەزانەوە و شەوەکەی نوێژی تەراویح دەست پێ دەکات.

**٧٤- دروستە پیاو لەماڵەوە بۆ خێزان و منداڵەکانی نوێژی تەراویح بکات** و ئاساییە بەتایبەت گەر لە شوێنێک بوون مزگەوت نەبوو یان دوور بوو.

**٧٥- سەبارەت بە ژمارەی ڕکاتەکانی تەراویح لەگەڵ** چۆنیتی نوێژی ویتر ، عائشە ڕەزای خوای لێ بێت دەفەرموێ: **(مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَزِيْدُ في رَمَضَان وَلا في غَيْرِهٍ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رِكْعَةٍ)** رواه الجماعة.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕەمەزان و غەیری ڕەمەزانیشدا لە یانزە ڕکات زیاتری نەکردووە.

وە ئەم (١١) ڕکاتە دوو دوو دەکرێت کە هەشت ڕکات کرا بە دوو دوو پاشان بۆ (٣) ڕکاتە ویترەکە دەتوانێ بە دوو شێواز بیکات

یەکەم : دوو ڕکات دەکات و سەلام دەداتەوە ، پاشان یەک ڕکاتەکەی تر دەکات .

دووەم : دروستیشە هەر سێ ڕکاتە ویترەکە بەیەکەوە بکرێ و تەنها تەحیاتی کۆتایی بخوێنێ ، واتە وەکو نوێژی مەغریب بەڵام تەحیاتی یەکەم ناخوێنێ .

٧٦- **کاتی دەستپێکردنی** لە دوای ئەنجامدانی نوێژی عیشا و دوو ڕکاتە سوننەتەکەی دوای عیشا نوێژی تەراویح دەست پێ دەکات .

## هەڵەی هەندێك لەڕۆژووەوانان

٧٧- هەندێ لەڕۆژووەوانان توشی هەندێ هەڵە دەبن ڕەنگە ببێتە هۆی کەمبوونەوەی پاداشتەکەیان ، وکاریگەری دەبێت لەسەر تەواوی ڕۆژووەکانیان ، یاخود کارێك دەکەن پێچەوانەی مەبەستی ڕۆژووە و ڕێز وفەزڵی ڕۆژووەکانیان کەم دەبێتەوە ، جا هەندێ لەو سەرپێچیانە :

* فێر نەبوونی ئەحکامەکانی ڕۆژوو .

* شەرم نەکردن لەخودا و نەپاراستنی زمان و چاو و دەست لە تاوان و خراپە ، کە ئەمەش وادەکات تەنها برسێتی و تینویەتی بۆ بمێنێتەوە.

* ئیسراف کردن لە خواردن وخواردنەوە.

* خەوتن لەکاتی پارشێو کردندا ، خۆی بێبەش دەکات لە داوای لێخۆش بوون کردن لە خوای گەورە.

* نەكردنی نوێژی بەیانی ، یاخود بەجوانی نەیكات و یاخود پیاوان نوێژ لەماڵەوە بكەن ونەچن بۆ مزگەوت

* زۆر خەوتن لەڕۆژدا ، حەتمەن ئەم كارە پێچەوانەی سوننەتی خودایە .

* بەفیڕۆ دانی كات لەنێوان خەوتن ، وتی وتیدا .

* ئیهمال كردنی قورئانی پیرۆز و خەتمە نەكردن، و بێ بەش بوون لەپاداشتەكەی .

* دوعا نەكردن لەكاتی ڕۆژوو شكاندندا و بەگشتی لەكاتی بەڕۆژوو بووندا.

* نەكردنی نوێژی مەغریب لەمزگەوت وخۆ خەریك كردن بەشكاندنی ڕۆژووەوە.

* نەكردنی نوێژی تەراویح نە لەمزگەوت بەجەماعەت .

* شەو درەنگ خەوتن

## شەوانی قەدر

**٧٨- بەسە بۆ پایە و فەزڵی شەوی قەدر کە خوای گەورە قورئانی تێدا دابەزاندوە و عیبادەت کردن لەو شەوەدا چاکترە لە هەزار مانگ ، هەروەکو خوای گەورە فەرمویەتی :** ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ١ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ٢ لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ٣ تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٖ ٤ سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ٥﴾ [القدر : ١ - ٥] .

شێخ محمد بن صالح العثيمين (بەڕەحمەت بێت) دەڵێت: ئەم سورەتە –سورەتی قەدر- چەند فەزڵ وچاکەیەکی هەمەجۆری تێدایە وەك:

یەکەم: خوای گەورە قورئانی تێدا ناردۆتە خوارەوە کە ڕێنموونی مرۆڤەکانە و هۆکاری خۆشبەختیانە لە دونیا و دواڕۆژدا.

دووەم: ئەم پرسیارەی کە لەم ئایەتەدایە [وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ] بۆ مەزنکردنەوەو گەورە ڕاگرتنە.

سێیەم: باشترە لە هەزار مانگ.

چوارەم: فریشتەی تێدا دادەبەزێت، وە فریشتەش دانابەزێت تەنها بۆ شتی بە پیزو بەرەکەت و خێر نەبێت.

پێنجەم: ئەم شەوە شەوی ئاشتی وسەلامەتیە، لەبەر زۆری پارێزراوی ئەم شەوە لە تۆڵەو سزا، ئەوەش بەهۆی ئەو پەرستش و گوێڕایەڵیەی کە بەندە ئەنجامی دەدات لەم شەوەدا.

شەشەم: خوای گەورە سەبارەت بە فەزڵ وچاکەی ئەم شەوە سورەتێکی بەتەواوەتی ناردۆتە خوارەوە، کە تا ڕۆژی دوایی دەخوێنرێتەوە.

**٧٩- پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر دە شەوی کۆتای بهاتبایە پشتی لێ دەبەست** ( واتە : دوور ئەکەوتەوە لە جووت بوون لە گەڵ خێزانەکانیدا ) و شەوەکانی زیندو دەکردەوە خێزانەکانیشی بە خەبەر دەهێنا بۆ نوێژ کردن و عیبادەت کردن و زیندوکردنەوەی شەوانی قەدر.

**٨٠- ئەم شەوە پیرۆزە هەر کەسێك لە دەستی بچێ ، هەموو خێریکی لە دەست چووە** ، کەسیش لە دەستی ناچێ جگە لە بێ بەش نەبێ ، لە بەر ئەوە سوننەتە بۆ موسڵمانی سور بوو لە سەر گوێڕایەڵی خوای پەروەردگار ، ئەم شەوە زیندوو بکاتەوە بە باوەڕەوە بۆ بەدەست هێنانی پاداشتی گەورەی خوای پەروەردگار ، ئەگەر ئەوەی ئەنجام دا خوای پەروەردگار لە تاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێت ، وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (مَنْ قَامَ لَيْلَةَ القَدْرِ إيمَاناً

وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنبِهِ) .واتە : هەر کەسێ شەوی قەدر زیندو بکاتەوە و باوەڕی پێی هەبێ و چاوەڕێی پاداشتی خوا بێ ، خوا لە تاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێ .

٨١- سوننەتیشە لەو شەوەدا پاڕانەوە زۆر بکرێت ، چونکە لە دایکە (عائشە) وە ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی : " ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر زانیم چ شەوێك شەوی قەدرە ، چی بڵێم لەو شەوەدا؟ فەرمووی : بڵێ : (اللهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي) واتە : خوایە تۆ لێ بوردەیت و لیبوردنت خۆش ئەوێ ، لێم ببورە .

**پرسیارێک** : ئەگەر ئافرەتێك لە شەوانی قەدردا بکەوێتە ناو سوڕی مانگانە! ئایا دەبێت چی بکات؟

ئەو ئافرەتەی لەشەوانی قەدر دەکەوێتە سوڕی مانگانەوە نابێت کەمتەرخەمی بکات و بخەوێت بەڵکو دەتوانێ شەوانی قەدر بە کۆمەڵێک عیبادەتی تر زیندوو بکاتەوە، لەوانە:

**یەکەم** : خوێندنەوەی قورئان ، بەڵام بە بێ دەست لێدان.

**دووەم** : زیکرەکان: وەکو (سبحان الله ، الحمد لله ، لا إله إلا الله ، لا حول ولا قوة إلا بالله)

**سێیەم** : داوای لێخۆشبوون کردن لە خودا، واتا: (أستغفر الله ) کردن.

**چوارەم** : دوعا و پاڕانەوە: واتا زۆر لە خودا بپاڕێتەوە و، داوای خێری دونیا و دوارۆژی لێ بکات، لەبەر ئەوەی دوعا

لە باشترینی پەرستشەکانە، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: (الدُّعاءُ هو العبادةُ)واتا: دوعا و پاڕانەوە پەرستشی ڕاستەقینە یە و خودی بەندایەتیە.

کەواتە: ئافرەت لە سوڕی مانگانەدا دەتوانێت ئەم پەرستشانە لە شەوی قەدردا ئەنجام بدات.

## مانەوە لە مزگەوت بۆ خوا پەرستن ( الإعتكاف )

**٨٢- ئیعتیکاف واتە: پەیوەست بوون بەمزگەوتەوە و** خۆ تەرخانکردن بۆ خواپەرستی ، کەئەوەش سونەتێکی جێگیرەو بەڵگەی قورئان و فەرموودەی لەسەرە .

**٨٣- مەبەست لە ئیعتیکاف ئەوەیە موسڵمان لە مزگەوتێك لە ماڵەکانی خوادا بمێنێتەوە بۆ خواپەرستی** وگوێڕایەڵی کردنی خوای پەروەردگار، ئەوەش لەبەر دەستکەوتنی پاداشت وفەزڵ و گەیشتن بە شەوی قەدر.

## زەکاتی سەرفترە

**٨٤- حوکمەکەی : زەکاتی سەرفترە فەرز و واجبە**
لەسەر هەموو بچووک و گەورە و نێرینە و مێ ینە و ئازاد و بەندەیەک لە موسڵمانان.

لەبەر ئەو فەرموودەیەی (ابن عمر رضي الله عنه) کە فەرموویەتی : (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَرَضَ زَكَاةَ الْفِطْرِ مِنْ رَمَضَانَ عَلَى النَّاسِ ...) واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەکاتی سەرفترەی مانگی ڕەمەزانی فەرز کرد بە سەر خەڵکیدا ...

**٨٥ ـ پیاو لە جیاتی کێ دەیدا ؟**

موسوڵمان سەرفترە دەدات بۆ خۆی و هەموو ئەوانەی کە نەفەقەیان لە سەرێتی لە بچووک و گەورە و نێر و مێ و ئازاد و بەندە.

## ٨٦ ـ بە کێ دەدرێت ؟

سەرفترە تەنها دەدرێت بەو کەسانەی کە شایستەن ، ئەوانیش تەنها بریتین لە هەژار و کەم دەستەکان ، لەبەر فەرموودەکەی (ابن عباس رضي الله عنه ) کە فەرموویەتی : **(فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ ) زَكَاةَ الْفِطْرِ : طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ ، وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ ...)** واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەکاتی سەرفترەی فەرز کرد بۆ پاک کردنەوەی ڕۆژووان لە قسەی پڕوپوچ و کرداری خراپ ، وە خواردنیش بێت بۆ فەقیر و هەژاران .

**تێبینی** : سوننەتە چەند کەسێک تەرخان بکرێت بۆ کۆکردنەوە و پاراستنی سەرفترە و پاشان دابەش کردنی بەسەر هەژاراندا ، ئەم سوننەتە پشت لێ هەڵکراوە ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی زیندووی دەکاتەوە

## ٨٧ ـ کاتەکەی :

**یەکەم** : زەکاتی سەرفترە لە دوای خۆر ئاوابوونی ئێوارەی شەوی جەژن واجب و فەرز دەبێت .

**دووەم** : وە باشتر و سوننەت وایە پێش دەرچوونی خەڵکی بۆ نوێژی جەژن ببەخشرێت.

**سێیەم** : بەڵام ڕوخسەت و ڕێگە دراوە بە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ پێش جەژن بدرێت بەو کارمەندانەی کە هەڵدەسن بە کۆکردنەوەی ، وە دروستیش نییە دوا بخرێت بۆ دوای نوێژی جەژن

وە شێخ محمد بن صالح العثیمین رحمه الله فەرمویەتی : هەر موسڵمانێك لە پێش (٢٨)ی ڕەمەزان سەرفترە بدات ئەوا دروست نییە و سەرفترەدانی لەسەر نەکەوتووە چونکە لە کاتی خۆیدا نەیداوە ."الشرح الـممتع على زاد المستقنع" : (٦ / ١٦٩ ـ ١٧٠)

## ٨٨ ـ حیکمەت لە سەرفترە :

خوای دانا و زانا سەرفترەی فەرز کردووە بۆ پاک کردنەوەی ڕۆژووان لە ووتەی پڕوپوچ و کرداری خراپە ، وە بۆ ئەوەی خواردنێکیش بێت بۆ فەقیر و هەژاران ، بۆ پڕکردنەوەی کەم و کوڕییەکانیان لەو ڕۆژە خۆشەدا.

## ٨٩ ـ چی دەدرێ بۆ زەکاتی سەرفترە ؟

زەکاتی سەرفترە دەبێت تەنها بە خواردن (طعام) بدرێت ، لەو جۆرە خواردنانەی کە خەڵکی هەر سەردەمێک دەیخوات ، لەبەر فەرموودەکەی (أبو سعيد الـخدري رضي الله عنه ) کە فەرموویەتی : (كُنَّا نُخْرِجُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) يَوْمَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ ، وَكَانَ طَعَامَنَا : الشَّعِيرُ وَالزَّبِيبُ وَالأَقِطُ وَالتَّمْرُ) کەواتە خەڵکی ئەم سەردەمەی ئێستای خۆمان دەبێت بۆ سەرفترە (ئاردی گەنم) یان (برنج) بدەن .

**٩٠ ـ بـڕەکەی :**

یەک (صاع) دەدرێت بۆ سەرفترەی هەر نەفەرێک ، بە کێشانەش نزیکەی دووکیلۆ و نیو دەکات بە پێوەری ئێستا.

**٩١ ـ پارەدان بۆ سەرفترە دروست نییە و دەبێت تەنها خواردن بدرێت نەک پارە :** سەرفترەدان لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بە خواردن و قوتی ئەو سەردەمە دراوە نەک بە پارە ، وە لە مەزهەبی ئیمامی (شافعي)دا پەیڕەوی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) کراوە تێیدا و دەبێت تەنها خواردن بدرێت بە سەرفترە و پارە نابێت و دروست نییە .

جا لێرەدا پێویستە لەسەر موسڵمانان شوێن سوننەتی پێغەمبەر بکەون (ﷺ) و ئەو مەزهەبەش کە موافیق و گونجاوە لەگەڵ سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) ئەوە هەڵبژێرن ، وە نابێت بە ویست و کەیفی خۆمان تەقلید بکەین و بە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) کردار و پەرستن بکەین !

بۆیە دروست نییە سەرفترە بە پارە بدرێت ، وە هەر کەسێک پارە بدات ئەوا سەرفترەدانی لەسەر نەکەتووە و قەرزار دەبێت هەتا خواردن دەدات بۆ زەکاتی سەرفترە وەک چۆن لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) سەرفترە بە خواردن دراوە ، وە خوای گەورە دەفەرموێت ( لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ) [الأحزاب] .

وە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت : ((مَنْ عمِلَ عَمَلاً ليسَ عليهِ أَمرُنا فهو رد)) صحيح مسلم رقم : (٤٤٦٨) .

واتە: هەر کەسێک هەر کردەوەیەک بکات،فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوا ڕەد دەکرێتەوە و لێی قەبوڵ ناکرێت.

**پرسیارێک** : ئەگەر کەسێک بڵێت : ڕاستە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) خواردن دراوە نەک پارە ، بەڵام ئێستا پارە باشترە بۆ هەژارەکان !!!

**ئەوا لە وەڵامیدا دەڵێین :**

سەرەتا بزانە کە (زەکاتی سەرفترە)دان عیبادەتە ، وە عیبادەتیش دەبێت بە پێی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) و کرداری صەحابەکان بکرێت بۆ ئەوەی خوای گەورە قەبوڵی بکات نەک بە پێی هەواو ئارەزووی خەڵک و بۆچوونی هەندێک لە زانایان کە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) و کرداری هەموو صەحابەکانە.

ئەنجا : ئایە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) فەقیر و هەژار زۆر تر نەبووە و ئەوانیش پێویستیان بە پارە نەبووە ؟!

ئەی باشە پارە بۆ ئەوان باشتر نەبوو لە خواردن ؟ بۆ ئەوەی بتوانن بە ویست و کەیفی خۆیان پێداوستیەکانیان دابین بکەن بەو پارەیە ؟ بەڵام صەحابە پابەندی سوننەت بوون و مەصڵەحەت چی و شوێن کەوتەی بۆچوون و هەواو ئارەزووی کەس نەبوون .

وە ڕەحمەتی خوا لە زانایان بێت بە ڕاستی ئەوان بۆ خوا صوڵحاوبوون و ئەوان بە ڕاستی شوێنکەوتەی سوننەتی پێغەمبەر بوون (ﷺ) بۆیە دەبینین فەرمان بە موسڵمانان دەکەن کەوا شوێن سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بکەون و تەقلیدی هیچ زانایەک نەکرێت ئەگەر پێچەوانەی سوننەت بوو .

ئیمامی (أبو حنيفة) فەرموویەتی: (إذا قلتُ قولاً يُخالفُ كتاب الله تعالى وخبـر الرسول (ﷺ) ، فاتركوا قولـي) .

وە ئیمامی (شافعي)ش فەرموویەتی : (كلُّ ما قلتُ فكان عن النبـي (ﷺ) خـلاف قولـي مـما يصح ، فحديث النبـي أولـى فلا تقلدونـي) .

وە ئیمامی (أحمد) فەرموویەتی : (لا تقلدنـي ولا تقل مالكاً ولا الشافعي ...وخُـذْ من حيث أخذوا) .

وە هەروەها ئیمامی (شافعي) فەرموویەتی : (أجمع الـمسلمون على أنَّ من استبان له سنة عن رسول الله (ﷺ) لـمْ يـحل لهُ أنْ يدعـها لقول أحد) .واتە : موسڵمانان یەک دەنگن لەسەر ئەوەی هەر کەسێک سوننەتێکی بۆ ڕوون بویەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) ئەوا حەڵاڵ نییە بۆی وازی لێبێنێت لەبەر قسەی هیچ کەسێک .

* **تێبینییەک** : کەسانێک هەن کاتێک کە ئەم باسەیان بۆ ڕوون دەبێتەوە دەڵێن : (ئێستا لەم سەردەمەدا لە سەرفترەداندا پارە بۆ فەقیر باشترە لە خواردن تاوەکو بتوانێت بەو بڕە پارەیە هەندێک پێداویستی تر جگە لە خواردن بۆ خێزانەکەی دابین بکات) !

**لە وەڵامی ئەو کەسانەدا دەڵێم :**

ئێمە دەبێت پابەندبین بە شەرعەوە نەک بە ڕاوبۆچوونی خەڵک ، ئەنجا ئەگەر ئەو کەسانە هەندە دڵسۆز و بە بەزەیین بەرامبەر بە فەقیر با خواردنیان بدەنێ لە بری سەرفترەدا وەک لە شەرعدا دیاریکراوە وە با لەگەڵ ئەوەیشدا هەندێک پارەیان بدەنێ وەک خێر و صەدەقە و یارمەتیدان .

کورتەی ئەم بابەتەی کۆتایی ئەوەیە :سەرفترە نابێت بە پارە بدرێت و دروست نییە ، چونکە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) خواردن دراوە بە سەرفترە نەک پارە

## نوێژی جەژن و سوننەت و ئادابەکانی

٩٢- نوێژی جەژن واجبە لەسەر پیاوان و سوننەتە بۆ ئافرەتان.

٩٣- چۆنێتی نوێژی جەژن

نوێژی جەژن دوو ڕکاتە و پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی جەژندا حەوت ( الله أكبر ) ی کرد لە ڕکاتی یەکەمدا ، پاشان فاتیحەی خوێند ، پاشان (الله أكبر ) ی کرد و پاشان چووە ڕکوع ، پاشان چووە سوژدە و پاشان هەستایەوە ، وە پێنج (الله أكبر ) ی کرد و پاشان فاتیحەی خوێند ، وە پاشان ( الله أكبر ) ی کرد و چووە ڕکوع و چووە سوژدە."

٩٤- خۆ شۆردن بۆ جەژن:

لە (نافع) ەوە: (عبدالله کوڕی عومەر) رضي الله عنه لە جەژنی ڕەمەزان پێش ئەوەی بچێت بۆ نوێژگە خۆی دەشۆرد.

٩٥- خواردنی چەند دەنکە خورمایەك بەر لە دەرچوون لەماڵ بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان وە سونئەتە بە تاک بیخۆی :

لە (أنس) رضي الله عنه دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ لە جەژنی ڕەمەزاندا دەرنەدەچوو هەتا چەند دەنکە خورمایەکی دەخوارد ، وە جەژنی قوربان هیچی نە دەخوارد تاوەکو نە گەڕایەتەوە پاشان لە قوربانیەکەی خۆی دەخوارد .

٩٦- خۆ جوان کردن و خۆ ڕازاندنەوە لە جەژندا .

(ابن القيم) دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ بۆ دەرچوون بۆ هەردوو جەژنەکان جوانترین جل و بەرگی لەبەر دەکرد.

٩٧- دەرچوون بۆ نوێژگە (المصلى) :

لە (أبو سعيد الخدری) ەوە رضي الله عنه فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ جەژنی ڕەمەزان وقوربان دەردەچوو بۆ نوێژگە (مصلى) یەکەم شت دەستی پێ دەکرد نوێژەکە بوو.

٩٨- ڕۆیشتن وگەڕانەوە لە نوێژگە (المصلى) :

سوننەتە بە پێ بچیت بۆ نوێژی جەژن:

لە (عەلی) ەوە رضي الله عنه بۆمان دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: (سوننەتە بە پێ بچیت بۆ نوێژی جەژن).

٩٩-ڕێگا گۆڕین:

لە (جابری کوڕی عبدالله) ەوە رضي الله عنه فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ڕۆژی جەژن بوایە ڕێگاکەی دەگۆڕی، واتە: لە ڕێگایەکەوە بڕۆیشتایە بۆ مزگەوت لە ڕێگایەکی ترەوە دەهاتەوە. (ئیمامی نەوەوی) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەفەرموێ: ئەگەر هۆیەکەشی نەزانراو بێ سوننەتە شوێنی بکەوین بەیەك جاری.

١٠٠-جەژنە پیرۆزە کردن لە یەکتر:

کە بەیەك گەیشتین سوننەتە بەم شێوەیە پیرۆز بایی لەیەکتر بکەین: تقبل الله منا و منکم.

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لە ڕۆژی جەژن بەیەك بگەیشتنایە بە یەکتریان دەوت: (تقبل الله منا ومنکم). واتە: خوا لە ئێمەو ئێوەیشی قەبوڵ بکات.

---

لە کۆتاییدا ئێمەش وەکو ستافی کەناڵی بەکورتی پیرۆزباییت لێ دەکەین بە بۆنەی خوێندنەوەی ئەم کتێبە بەسوودە و هیواداریین سودی باشت لێ بینیبێت و زیاتر شارەزاتری کردبێت لە حوکم و ئادابەکانی ڕۆژووی ڕەمەزان ، وە هەوڵبدە زیاتر لە جارێک بیخوێنیتەوە و بیشینێری بۆ هاوڕێکانتان .

وصلَّى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم .

بۆ هەر تێبینی و پرسیارێک پەیوەندی بکەن بە تلیگرامی ئەم ژمارەیەوە

٠٧٧٠١٥١٧٣٧٨

پاشکۆی کتێب

# ڕەوشتی ڕۆژووەوان

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە ، وە درودو سڵاو لە سەر گیانی پێغەمبەری خوا ، وە لەسەر خێزان و کەس وکاری ئیماندارو هاوەڵان و شوێن کەوتوانی تا ڕۆژی دوایی.

بەروبوومی سەرەکی ڕۆژوو ئەوەیە کەسی ڕۆژووەوان تەقوای خوا بەدەست بێنێت ئەوەش بەجێ بەجێکردنی فەرمانەکانی خودا ودوور کەوتنەوە لەحەرامکراوەکانی دێتە دی ، هەروەک خوای گەورە و میهرەبان فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٨٣ ﴾ **البقرة**

واتە: ئەی باوەڕداران ئێوە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانتان لەسەر فەرز کراوە ، هەروەکو چۆن لەسەر ئوممەتانی پێش ئێوەش فەرز کرابوو ، بەڵکو تەقوای خوای گەورە بکەن.

ڕۆژوو قوتابخانەیەکی گەورەیە ، لەو مانگەدا کەسانی ڕۆژووەوان چەندان ڕەوشتی بەرز فێر دەبن ، وڕزگاریان دەبێت لەچەندەها خو ڕەوشتی ناشیرین ، و ڕادێن لەسەر خۆ پارێزی ودوور بوون لەحەرام ، و واز دێنن لەشتی خراپ و تاوان و نابەجێ.

**جا لەو سیفاتە چاکانەی کە کەسی ڕۆژووەوان بەدەستی دێنێت:**

## یەکەم : ئارام گرتن:

لەڕۆژوودا سێ جۆر ئارام گرتن کۆ دەبێتەوە :

١- ئارام گرتنە لەسەر گوێڕایەڵی خوای گەورە .

٢- ئارام گرتن لەسەر سەرپێچی نەکردنی خوای گەورە .

٣- ئارام گرتن لەسەر قەزا وقەدەرەکانی .

ڕۆژوو ئارام گرتنە لەسەر گوێڕایەڵی خودا ؛ چونکە مرۆڤ ئارام دەگرێت لەسەر ئەو گوێڕایەڵیە کەڕۆژوو گرتنە وئەنجامی دەدات .

وەهەروەها ئارام گرتنە لەسەر دەرنەچوون لەفەرمانی خودا ؛ چونکە کەسی بەڕۆژوو لەو شتانە دوور دەکەوێتەوە کە حەرامن لەسەر ڕۆژووەوان.

وەهەروەها ئارام گرتنە لەسەر قەدەری خودا؛ چونکە کەسی ڕۆژووەوان توشی ناڕاحەتی برسێتی وتینویەتی وبێتاقەتی دەبێت ؛ هەر بۆیە ڕۆژوو بەچڵە پۆپەی ئارام گرتن دادەنرێت ؛ چونکە هەر سێ جۆرە ئارام گرتنەکەی تێدایە ، و خوای پەروەردگاریش فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجۡرَهُم بِغَيۡرِ حِسَابٖ ١٠ ﴾ [الزمر: ١٠].واتە: تەنها ئارامگران ئەجرو پاداشتی خۆیان وەرئەگرن بەبێ ژمارە، واتە: ئەجرو پاداشتێکی یەکجار زۆر لە بەهەشتدا.

## دووەم : ڕاستگۆیی

یەکەم شت کەڕۆژوو فێری ڕۆژووەوانی دەکات ڕاستگۆ بوونە لەگەڵ خودادا ؛ لەبەر ئەوەی ڕۆژوو کارێکی نهێنی یە لەنێوان عەبد وخودادا ، ومرۆڤ توانای ئەوەی هەیە بڵێ بەڕۆژووم ، ودواتر بەنهێنی خواردن بخوات .

وەڕاستگۆیی ڕێگری لەخاوەنەکەی دەکات لەقسەی درۆ وپڕ وپووچ ، وبەهەمان شێوە ڕۆژووش ، هەروەک لەو فەرموودەیەدا هاتووە کەئەبو هورەیرە خوای لێ ڕازی بێت گێڕاویەتیەوە ودەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (مَن لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ والعَمَلَ به والجَهْلَ، فليسَ لِلَّهِ حاجَةٌ أنْ يَدَعَ طَعامَهُ وشَرابَهُ) (أخرجه البخاري) (١٩٠٣). واتە: هەرکەسێک واز لەقسەی پڕ وپووچ ودرۆ وکار کردن پێیان نەهێنێت، ئەوا خودا هیچ پێویستیەکی بەوە نی یە خۆی بگرێتەوە لەخواردن وخواردنەوە.

## سێیەم : ماڵ بەخشین و خێر و صەدەقە و سەخی بوون

چەندان بەڵگەی شەرعی هەن لەبارەی ئەوەی پاداشتی کردەوە چاکەکان چەند قات زیاد دەبن لەشوێنە چاکەکاندا ، هاوشێوەی ڕەمەزان وجگە لەویش.

بۆیە گرنگە کەسی ڕۆژووەوان ئەوەی خۆی گردۆتەوە لەشتی حەڵاڵ ئەوانەی ڕۆژوو دەشکێنن ، دوور بکەوێتەوە لەهەموو حەرامکراوەکان ، وخۆی سەرقاڵ کات بەکردەوەی چاکەوە ، وخۆی بڕازێنێتەوە بەڕەوشتی دڵفراوانی و سەخی بوون ، لەوانە بەتایبەت خواردن دان بەڕۆژووەوانان .

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی خوای لێ ڕازی بێت گێڕاویەتیەوە ودەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (مَن فَطَّرَ صائمًا، كانَ لهُ مِثلُ أجرِ الصَّائمِ، مِن غيرِ أنْ يَنقُصَ مِن أجرِ الصَّائمِ شيئًا )

واتە: هەرکەسێک خواردن بەڕۆژووەوانێک بدات بۆ ئەوەی ڕۆژووەکەی پێ بشکێنێت ، ئەوا هاوشێوەی ئەو پاداشتی دەست دەکەوێت بێ ئەوەی لەپاداشتی کەسە ڕۆژووانەکەش کەم بێتەوە .

بۆیە گرنگە مرۆڤ سوور بێت لەسەر خواردن دان بەکەسانی ڕۆژووەوان بەپێی توانا ، بەتایبەت گەر کەسە ڕۆژوانەکە هەژار بوو ، یاخود بێ توانا بوو .

• ئەو ڕۆژووەوانەی کەخودا ماڵی پێ بەخشیوە ، وبەدرێژای ساڵ ڕاهاتووە لەسەر خۆشگوزەرانی وخواردنی خواردن وخواردنەوە وڕێگا وجێگای باش ، بێ ئاگا بووە لەهەژاران وبێ نەوایان ، گرنگە بۆ ئەم کەسە لەکاتی ڕۆژوو گرتندا ڕەوشت وسلوکی گۆڕانکاری بەسەردا بێت ، وهەستی بەرانبەر جگە لەخۆی بجوڵێت ، ئەو کاتەی هەست بەبرسێتی دەکات ، هەست بەناخۆشی بێ بەش بوون وهەژاری دەکات ، ئەوکات لەئازاری برا هەژارەکانی تێ دەگات ، لەم ڕێگەیەوە زۆر جار دەست دەکات بەخێر وسەدەقە ودەستی یارمەتی درێژ کردن بۆ کەسانی هەژار ونەدار .

## چوارەم : داوێن پاکی

• خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ ﴾ البقرة

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خودا ئەوەی ڕوون کردووەتەوە کەڕۆژووی بۆیە فەرز کردووە بەڵکو تەقوای بکەین ، ڕۆژوو وەسیلەیەک بۆ تەقوا ، وتەقواش ئەوەیە لەنێوان خۆت وسزای خودادا پارێزەرێک هەبێت ، ئەوەش بەجێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی ، ودوور کەوتنەوە لەڕێگری لێ کراوەکانی دەبێت.

کەسی ڕۆژووەوان بەڕۆژوو ڕادێت لەسەر داوێن پاکی ، و پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بەمە داوە وفەرموویەتی: (يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ البَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فإنَّه أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَن لَمْ يَسْتَطِعْ فَعليه بالصَّوْمِ، فإنَّه له وِجَاءٌ.) (أخرجه البخاري (٥٠٦٦)، ومسلم (١٤٠٠).

واتە: ئەی چینی گەنجان هەر کەس لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەیە ئەوا با ژن بێنێت، چونکە ژن هێنان چاو دەگرێتەوە لە نەزەر کردن و قەڵایەکیشە بۆ عەورەت و دەتپارێزێت، وە هەر کەس توانای ژن هێنانی نی یە ئەوا با ڕۆژو بگرێت چونکە ڕۆژو دەبێتە پارێزەر بۆی.

پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردووەتەوە کەڕۆژوو پارێزەرە بۆ کەسی ڕۆژووەوان ، و هۆکارێکە بۆ داوێن پاکی ، ئەوەش لەبەر ئەوەی شەیتان هاوشێوەی خوێن بەنێو دەمارەکانی مرۆڤدا دێت ودەچێت ، وڕۆژووش ئەو هاتن وچوونە لاواز دەکات ، ودەسەڵاتی شەیتان لاواز دەکات ، و هێزی ئیمان بەهێز دەکات.

## پێنجەم : لەسەر خۆیی وخواردنەوەی ڕق ولێ بوردەیی

پێویستە کەسی ڕۆژووەوان کاتێ کەسێک جوێنی پێ دەدات یاخود قسەی پێ دەڵێت وشەڕی لەگەڵ دەکات بەدەنگی بەرز بڵێت: من بەڕۆژووم.

ئەبو هورەیرە خوای لێ ڕازی بێت گێڕاویەتیەوە ودەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (وإِذَا كانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ فلا يَرْفُثْ ولَا يَصْخَبْ، فإنْ سَابَّهُ أَحَدٌ أَوْ قَاتَلَهُ، فَلْيَقُلْ: إنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ) (أخرجه البخاري (١٨٩٤، ومسلم (١١٥١)، واللفظ له) .

واتە: ئەگەر ڕۆژێک کەسێکتان بەڕۆژوو بوو با ئەو ڕۆژە قسەی ناشیرین و هات و هاوار نەکات، خۆ ئەگەر کەسێک جنێوی پێدا و شەڕی پێ فرۆشت با بڵێت؛ من کەسێکی بەڕۆژووم .

## شەشەم: سەلامەتی دڵ ودەروون لەڕق وکینە

عبداللەی کوڕی عەباس رضي الله عنهما گێڕاویەتیەوە ودەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (صومُ شَهرِ الصَّبرِ وثلاثةِ أيَّامٍ مِن كلِّ شَهرٍ يُذهبنَ وَحَرَ الصَّدرِ).

واتە: ڕۆژووی مانگی ئارام گرتن (واتە مانگی ڕەمەزان) ، و سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێک ، چڵک وپیسی سنگ ناهێڵێت .

مانای (وَحَرَ الصَّدرِ) : واتە: پیسی ، وحیقد ، یاخود تورەیی ، یاخود دوو ڕوویی ناهێڵێت ، بەشێوەیەک هیچ پیسیەکی تێدا نامێنێت ، جێگایەکی تێدا نامێنێت بۆ ڕق وکینە ، وتورەیی ..هتد .

## حەوتەم: ئیرادە بەهێز بوون وتواناى خۆ ڕاگرى

ڕۆژوو وا لەکەسى ڕۆژووەوان دەکات ئیرادەى بەهێز بێت ئەوەش سەرچاوەى گرتووە لەئیمان بوون بەخوا ، وهێزى جێ بەجێ کردنى فەرمانەکانى کە یەکێکیان فەرمان کردنە بەڕۆژوو گرتن لەپێناو خودادا ، و وەک تەماحێک بۆ ئەو پاداشتەى کەبۆى دانراوە لەدوا ڕۆژدا .

ڕۆژوو کەسى ڕۆژووەوان ڕا دێنێت لەسەر خۆ ڕاگرى ، وزاڵ بوون بەسەر نەفس ودەروونداە ، وگرتنى جڵەوى تاوەکو بەگوێى دەکات بەئیزنى خودا لەو شتانەدا کەخێر وخۆشگوزەرانى تێدایە ، وە نەفس فەرمان دەکات بەخراپە مەگەر نەفسێک خودا ڕەحمى پێ کردبێت وپاراستبێتى ، بۆیە هەرکات مرۆڤ بەگوێى نەفس وئارەزووەکانى کرد بەهیلاکى دەبات ، و گەر جڵەوگیرى کرد وزاڵ بوو بەسەرى دا ئەوکات دەتوانێت بیبات بەرەو بەرزترین پلە ، و ئامانج بەویستى خودا ، ئەوەش بەدەست نایەت مەگەر بۆ کەسێک نەبێت ڕۆژوویەکى شەرعى گرتبێت بەهەست کردن بەعیبادەت کردن بۆ خودا ، وچاوەڕێ کردنى پاداشتەکانى پەروەردگار.

وئەو ڕۆژووەوانەى کە واى لەنەفسى خۆى کردووە دوور کەوێتەوە لەشتە دروستەکان لەبنەڕەتدا ، وزاڵ بووە بەسەر ئارەزووەکانى لاشەیدا ، حەتمەن دەتوانێت بەویستى خودا دوور کەوێتەوە لەو شتانەى حەرامە لەهەموو کات وساتەکانى ترى تەمەنیدا .

## هەشتەم : دڵ ئارامی

لەحەقیقەتدا ڕۆژوو ڕێگایەکە بۆ ڕزگار بوون لەهێزی دەروون ئەوەی کەمرۆڤ بەرەو هەلاکەت دەبات ، وڕێگایەکە بەرەو ڕووناکی وئەمین بوون ، وهەست کردن بەخۆشی وئارامی دڵ ودەروون .

وە یەکێک لەو شتانەی کەوا دەکات ڕۆژوو ببێتە هۆکارێک بۆ دڵ ئارامی کەسی ڕۆژووەوان ، سڕینەوەی تاوانە ، تاوان دڵ ڕەق دەکات ، ومرۆڤ توشی دڵە ڕاوکێ دەکات و نائارام دەبێت ، لەبەسەرهاتی عومەر لەگەڵ حوزەیفەدا خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە لەبارەی ئەو فیتنانەی کەڕوو دەدەن وپێغەمبەر ﷺ هەواڵی لەبارەوە داون وفەرموویەتی: (فتنةُ الرجلِ في أهلِه ومالِه وولدِه وجارِه تُكفرُها الصلاةُ والصومُ والصدقةُ ...) أخرجه البخاري (٥٢٥)

واتە: فیتنەی پیاو لەگەڵ ماڵ ومنداڵ وخێزان ودراوسێکانی دا ، نوێژ وڕۆژوو وخێر وفەرمان کردن بەچاکە وڕێگری کردن لەخراپە دەیانسڕێتەوە .

هەروەک ڕۆژوو وا لەڕۆژووەوان دەکات دڵ ودەروونی خاڵی بێت بۆ زیکر ویادی خودا ؛ چونکە بەکارهێنانی ئارەزووەکان مرۆڤ غافڵ وبێ ئاگا دەکەن ، ودڵ ڕەق دەکەن .

وەمەعلومە هەرکات دڵ خاڵی بوو بۆ زیکر ، ئەوا ئارام دەبێت ، هەروەک خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾ الرعد
واتە: وە بزانن کە تەنها بە زیکرو یادی خوای گەورە دڵەکان هێمن و ئارام و ئاسوودە ئەبێت.

## نۆیەم : واز هێنان لەغەیبەت و درۆ و قسەی ناشیرین

کەسی ڕۆژووان ئەوەی بەحەق بەڕۆژووە ئەوەیە کەڕۆژوو کاریگەری دەبێت لەسەر خو ڕەوشتی ومامەڵە کردنی لەگەڵ کەسانی تردا ، بەڵام ئەو کەسەی کەتەنها وەک عادەتێک بەڕۆژوو دەبێت ، بەشێوەیەک بەڕۆژوو دەبێت کاتێ دەبینێت خەڵک بەڕۆژووە ودەیشکێنێت کاتێ دەبینێت خەڵک شکاندوویانە ، وبەشێوەیەکی ئیمانی نەچووەتە نێو قوتابخانەی ڕۆژووەوە ، یاخود وا لەڕۆژوو گەیشتووە کەتەنها خۆ گرتنەوەیە لەخواردن وخواردنەوە و زمان وچاوی بەرەڵا کردووە لەشتە حەرامکراوەکان و نایان پارێزێت ، لەکاتێکدا وازی لەشتی موباح ودروست هێناوە لەخواردن وخواردنەوە وجیماع کردن لەگەڵ خێزانی دا !

ئا ئەم کەسە ئەم فەرموودەیەیی بەسەردا جێ بەجێ دەبێت کەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ والعَمَلَ به والجَهْلَ، فليسَ لِلَّهِ حاجَةٌ أنْ يَدَعَ طَعامَهُ وشَرابَهُ) (أخرجه البخاري) (١٩٠٣).

واتە: هەرکەسێک واز لەقسەی پڕ وپووچ ودرۆ وکار کردن پێیان نەهێنێت ، ئەوا خودا هیچ پێویستیەکی بەوە نی یە خۆی بگرێتەوە لەخواردن وخواردنەوە

لەکۆتاییدا زۆر گرنگە کەسی ڕۆژووەوان ئاگاداری گوناە وتاوان بێت لەڕەمەزاندا ، چونکە خێری ڕۆژوو کەم دەکاتەوە ، وهیچ مانایەک بۆ حیکمەتی ڕۆژوو ناهێڵێتەوە ، هاوشێوەی درۆ وغەش ودوو زمانی وتەماشا کردنی شتی حەرام ، وگوێکرتن لەگۆرانی ومۆسیقا ، وجگە لەم تاوانانەش .

وصلَّى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم .

## برا و خوشکانی بەڕێز :

ئامۆژگاریتان دەکەین بە دابەزاندنی ( ئەپڵیکەیشنی وەڵامەکان) کە زیاتر لە (٣٥٠٠) پرسیاری وەڵامی شەرعی تێدایە لە هەموو بوارەکانی شەریعەتدا، یەکجار دایبەزێنە و (٣٥٠٠) پرسیار و وەڵامی شەرعی بەبێ ئینتەرنێت بخوێنەوە ، وە بۆ هەردوو سیستەمی ios و android بەردەستە ، ئەتوانن لە ڕێگەی ئەم لینکەوە دایبەزێنن .

http://onelink.to/ekb63b

